# بەرەو منداڵی بە جلی پایزەوە



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان:

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، شەقامی گوڵان، هەولێر

# بەرەو منالّی بە جلی پاییزەوە

## بناغە و ئەزموونی شیعر

کەریم دەشتی



«بلیمەتیی هێنانەوەی منداڵێتییە بە ئەنقەست»

بۆدلێر

ناوی کتێب: بەرەو منالّی بە جلی پاییزەوە – بناغە و ئەزموونی شیعر
نووسینی: کەریم دەشتی
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٦٠٢
دەرهێنانی هونەری ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
دەرهێنانی بەرگ: حەمید ڕەزا ئازموودە
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
چاپی یەکەم، هەولێر– ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٤٨٤)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

## بەشی یەکەم

# لە ئەزموونی ژیاندا

١

ئێستێشی لەگەڵدابێ سەرچاوەی ئەشق بە ڕابردوو کوێر نەبۆتەوە، پێشم وا نییە وەها زوو مرۆڤ دەستبەرداری خەزنەی ڕابردووەکانی خۆی بێ، مەرج نییە ڕابردوو شیرین بێ تا خەڵکی هێندە عەوداڵییان بێت، بەڵام داهاتووەکانی مرۆڤ وا دەکات کەڵکەڵەی گەڕانەوە بۆ ئەو ڕابردووانە هێندە بە گوڕ بێت. لە جیهانی هەر نووسەرێکدا منداڵی وەک لەشکرێکی پڕ جوانی ڕووپەڕێکی گەورە داگیردەکات، زۆر جاران نووسینەوەی ئەو هێرشەی منداڵی دەقێکی لەززەتبەخش دادەهێنێ. شتەکانی منداڵی هەمووی سادە و ساکارن. بەڵام لەقووڵاییدا کاری خۆیان دەکەن و ئاسەوارییان لەناو پانتایی ئێستاکاندا وەدیار دەکەوێ.

ئەم چەند شتانەی من نووسیومن لە ئەزموونی ژیاندا بەشێکی زۆر بچووکی ئەو دونیا سیحراوییەی منداڵی خۆمە، ناخی مرۆڤیش زیاتر بەوە دەکرێتەوە کە ئەوانی دیکە لێی بخوێنەوە، ئەگینا لە گۆشەگیریدا ماناکانی ژیانی دەمرێ، بەڵام ئەگەر بابایێکی دیکەش بیبیستێ دەها باشتر. لەو ژیانەدا ئازارەکان زۆریان هاوچەشن و هاوئاوازن. وەک دایکم هەموو جارێک بۆم دەگێڕێتەوە دونیا هێندە بەرفراوان نەبوو، ئاسمان هێندە پڕ دوکەڵ نەبوو، بەڵکو گوندێکی تەواو بچووک بووە، پەیوەندییەکان سادەو ساکار بوون کۆڵانەکان تژی ئەڤین بوون، ژوورەکان پڕ لە سەفاو وەفا بوون، قسەی دایکانیش هەمیشە و تا ئەبەد لەناو ڕەحمی ئەفسانەکانەوە هەڵدەچێ و جۆرێک لەقوماشی قودسیەت لەبەر دەکات، من پڕ زیرەترین منداڵەکانی ئەو بوویمە و جار جارە هێندەم لێ پەست بووە، لە ڕقان منی فڕێداوەتە بەر پڕوشەی باران و خوشکەکانم دەگێڕنەوەو دەڵێن ئەوکات لەهەموو دەمێک جوانتر دەبووی، چونکە کە



باران لەدەم و چاوتی دەدا بەدەست و قاچ لە جوولەیێکی سەیردا دەبووی بە تەماتە، کەواتە باران یەکەم هاوڕێ و میوانی من بووە لە ژیاندا، ئای ئێستێکە من چەند لەگەڵ باراندا دۆستم، چۆن چۆنی دەمگەڕێنێتەوە منداڵی– بە هەر حاڵ من مایەی هیلاکییێکی زۆری دایکم بوویم، هەڵبەت پایزێکی درەنگوەختیش گێژەلووکەی خۆی دەکرد بە ژووری ساردوسڕی ماڵەکەمان، کە ئێستا ئەوەندە دڵم بە پایز دەکرێتەوە ڕەنگە هی ئەوە بێ لەگەڵ لەدایک بوونمدا با چۆتە ناو موخی ئێسقانەکانم... هەمیشە زەنگێکم بەرەو ڕابردوو بۆ لێدەدات.

٢

زۆر جاران بیر دەکەمەوە کە منداڵێتی ئێمەمانان چەمکێکی جیاوازی هەیە دەگەڵ منداڵێتی دنیا و نەوەکانی ئێستامان، بەوەی کە هەرگیز وەک چۆن ئێستا بۆ منداڵان بیر دەکرێتەوە بۆ ئێمەمانان بیر نەکراوەتەوە و وانەبووە، دنیای منداڵێتی ئێمە دنیایێکی خوڵەمێشی بووە وەکو ئێستا ڕەنگاوڕەنگ نەبووە، ئامانجی منداڵبوون بەوەی کە نەبڕانەوەی نەسل و میراتگری بووە، بۆ نەبڕانەوەی نەسلیش هێندە بەخەم نەبوون ئەوەندەی لەپشتی میراتەوە کاریان کردووە، بەرهەحاڵ من دەمەوێ باسی منداڵێتی خۆم بکەم "خوایە کارێکی چەند سەخت و دژوارە» تاکە شتێکە درۆ قەبوڵ ناکات، ژیانیش بێ درۆی شیرین دژوارە...

"لایلا کوڕم لایلایێ
ئاخر لۆ خەوت نایێ
رووقەندی قەندەهارێ
بنوو هەتا بەهارێ"

ئەمە لاوانەوەی دایکم بووە بۆ من، هەڵبەت زۆرجاران کە ئەوەشی دەگێڕایەوە دەیگوت تۆمان بردبووە ئەو ژوورەی کە دوور بوو لە حوجرەی باوکت کە پێشتر شوێنی دەواران بووە. هەڵبەت زۆربەی دایکانی کورد کە کوڕەکانیان دەلاواندەوە وردە وردە فرمێسکی یادەوەریشیان دادەباراند و دەگەڕانەوە ناو دنیای جارانیان و ڕابردووی خۆیان بیر دەهاتەوە چونکە بێ ئەسەر نییە ئێستاشی دەگەڵدا بێ لەهەر شوێنێ لایلاولاوانەوە بۆ منداڵ بکرێ، فرمێسک جێ بە بزە چۆڵ دەکا...

هەمان ئەو دڵۆپە فرمێسکانە ئارامی دەبەخش بە دایکان. ئارامییەک کەس نازانێ لە کوێوەدێن.

٣

منداڵی من لە ناو گێژاوی ڕۆژگار و سەختەندازیدا بە ئاستەم دیار دەدا، وەک تاوسێکی خێراو تیژپەڕ بوو کە بەرەو دۆڵەکان بچێ و لەناو تەمێکی خەستدا ون ببێ ئاوایە، بەم پێیە من تەنها لەدوور دوورەوە ئەم سیمایە دەبینم و لێم بەدوور دەکەوێتەوە، لەبەر ئەوەی من کە باوکم کۆچی کردووە ئەوەندە بچووک بوویمە تا ئێستا ناتوانم ڕوخساری باوکم بهێنمە بەرچاو، لەو بچووکییەوەش ئەگەر بینیبێتم ئەوە ئاسەواری لەناو مێشک و زەینمدا نەماوە، کە کەوتوومەتە سەر پێکانیشم تەنها دایکم و سێ خوشک و چوار برام بینیوە هەندێکیان بچووک بوون... تەنها برا گەورەکەم نەبێ کە لە دەوری هەرزەکاری بوو، ئەگەر دایکم نەبووا هەرگیز ئەو پیاوە نەدەبووم، وەک ئافرەتێکی هەڵۆ باڵی پڕ لە سۆزی بەسەر ئێمەی منداڵدا داهێناوە، سەرەڕای هەموو سەختییێکی ژیان ئێمەی یەکەیەکە لە پردە دژوارەکانی ژیاندا پەڕاندۆتەوە، بۆیە هیچ شتێکی خۆشی منداڵێتیم پێ نییە بیگێڕمەوە، ئەوە نەبێ کە منداڵی خۆی لەخۆیدا خەونێکە خۆش، هیچ شتێکم نەبووە وەک منداڵانی دنیا پێیەوە خافڵا بووبێتم، هەمیشە لەناو جلێکی هەژارانەوە پێ خاوەست بوویمە، کۆڵانەکەمان لە هەولێر هەمیشە لەژێر هەڕەشەی لافاو دابووە، جۆگەلە ئاوێکی هێجگار پیس و پڕ لەزبڵ و سیاناوی لەناوەندی کۆڵاندا بوو، سەیرە من هەمیشە لە کەناری ئەو جۆگەلەیەدا یاریم کردووە کە ملیار ملیار ڤایرۆسی تیا بووە، تۆپێکم نەبوو دایکم بە پەڕۆ بۆی دروست دەکردم، قۆناغی سەرەتاییم نیوە لەسەر ئەو جۆگەلەیە و نیوەش لە قوتابخانەی هەولێری سەرەتایی بەسەر بردووەو تەواو کردووە، من زۆر زوو چوومەتە خوێندن، پاشان گۆزراینەوە بۆ قوتابخانەی- مەولەوی کە ئەو دەم دەوامەکەی دیکە قوتابخانەی- مستەوفی- بوو، لەبیرمە لە ساڵۆنی قوتابخانەکەماندا وێنەیێکی گەورەی مەولەوی کرا بوو لەسەر دار نەخشێنرابوو بەڕاستی هەمیشە بەدیار ئەو وێنەوە دەوەستام و بیرم لێ دەکردەوە بۆیە ئێستا وێنەی مەولەوی لەناو زەینمدا بۆ ئەبەد ناسڕێتەوە، هەروەها کە ئێمە لە دەوام بەردەبووین، قوتابیانی- مستەوفی-



بەهەموو هێزیانەوە هاواریان دەکرد "مەولەوی بەوەی وەبی" کە ئەوانیش تەواو دەبوون ئێمە هاوارمان دەکرد:

"مستۆفی کەرەکەت تۆپی"

ئیدی دەبوو بە هەڵلا، ئێستێکەش قیژەو هاواری منداڵانم لە گوێدا دەزرینگێتەوە، خودایە ئەوە چ قیامەتێک بوو؟ خودایە ئەوە چ لەززەتێک بوو کە هیچ فیلمێکی ئێستای دونیا هێندە زاکیرەم تیژ ناکاتەوە.

٤

گەورەترین زبڵخانەی مێژوو لەگەڕەکی تەیراوە بوو، کە هەرچی زبڵ و پاشماوەی پیسی و خواردن و پۆخڵی شاری هەولێر بوو لەو کەندەدا ڕوویاندەکرد، کەندێکی گەورەی قووڵ بوو ئێمە لە منداڵی ناومان نابوو کەندی قوشە شێتی، لەتەک جادەکەی سی مەتری بوو نزیک مزگەوتی حاجی عەبدوڵلا، کەچی ئێمەی منداڵ کاتێک بەرەو ئەو زبڵدانە دەچووین وەک ئەوە وابوو کە بەرەو یوتیبێکی گەورە بچین، بەرەو باخێکی ڕەنگاوڕەنگ بچین، سەیر ئەوە بوو پێخواست بووین ڕەنگە یەک ملیار شووشەی شکاویشی تیا بووبێ زبڵخانەیێکی هێندە گەورە بوو کە دەچووینە ناوییەوە تەنها بۆ نیوەڕۆ لێی دەبووینەوە، ئیدی بە دڵخۆشی دەگەڕاینەوە ماڵەوە، نازانم چیمان لەو زبڵدانە دابوو؟ چیمان دەست دەکەوت؟ هێندە عەوداڵی ئەو شوێنە پیسە بووین؟ کابرایێکی زبڵڕێژیش هەبوو ناوی عەولا پۆخچی بوو ئێمە پێماندەگوت "زبۆ" کاری ئەو پیاوە پاککردنەوەی تەوالێتەکان بوو و هەر لەو زبڵخانەیە هەڵیدەڕشت.

٥

لە منداڵیدا شتێکم وەبیردێتەوە تەزوویێکی خۆش دەدا بە گیانم ئەویش ئەو ڕۆژانە بوو کە نمایشی سەربازی دەبوو لە ئۆردوی هەولێر. ئەوکاتە بەسەربازگەیان دەگوت ئۆردی، هەڵبەت وەکو ئێستا ترسناک نەبوو، خەڵک بۆ سەیران دەچوونە ناو ئۆردی و کەس پەیوەندی بەئێمەوە نەبوو، یاخود ماڵە هەژارەکان بۆ کۆکردنەوەی سەموون و خواردن دەچوونە ناو ئۆردی. ئیدی لەوێ نمایشی سەربازی خۆش خۆش ئەنجام دەدرا، ئەوکات ئۆردی لە دەرەوەی هەولێر بوو وەک بەهارستانێک وابوو، بەڵام داخی

گرانم کە گەورە بووم خوێنی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆم بینی چۆن لەو بەهارستانەدا هەڵدەڕژاو بەسەریەک لەسێدارەیان دەدان.

٦

رۆژێکیان هەموو منداڵانی گەڕەک کۆبووینەوە "نایف تیوتیو و جەوهەرو پووتەو (ئەنوەر) قەللاج و ڕەوفە درێژ و عەبدوڵڵا سلێمان، وەلید زارێ و تەحسینە قووت و عارفە خیلّ و عەلیکۆ و یاسین و سەعۆ و کامیل و سالاری کێشکە کوژ... هتد. بە ئەقڵی منداڵانەی خۆمان بڕیارمان دا شار بەجێبهێڵین و ڕوو بکەینە ناو شاخان، ئەوکات هەولێر زۆر چۆڵ بوو بەهەمان ئەو کەسانەیان دەگوت– ئەشقیا– کە لەدژی ڕژێمی ئەوسا ڕوویان لەشاخ دەکرد یاخود دەیانگوت چووینە ناو کۆمەرەی، ئیدی بەڕێکەوتین تا گەیشتینە ناعوری زەمینێکی کشتوکاڵییەوە زۆر چۆڵ بوو بۆ ماوەیەک ماینەوە ئێوارە داهات بە ناچاری گەڕاینەوە گوایە شارمان جێهێشتووە، ئیدی ئێمەی ئەشقیاکان گەڕاینەوە شار کە هەرگیز نەچووبووینە دەرەوە.

٧

من هەر لە منداڵییەوە هاودەمی گۆڕستان بوویم، چونکە گۆڕستانێکی گەورە بەناوی– قەبرستانی مەلا ڕەشید– لە نزیک ماڵی ئێمە بوو، چەندین بەهاری عومری منداڵێتیم لەو قەبرستانە بەسەر بردووە، هەر بۆیەش قەبرستانەکانم خۆش دەوێن، وەک بڵێی لە مێژە هاوڕێمن وهاوسۆزییێکی زۆرم لەگەڵیاندا هەیە، هیچ نووسینێکی سەر کێلی ئەو گۆڕستانە نییە من نەمخوێندبنەوە لەم گۆڕستانەدا دوو گومەز هەبوون کە بە چەندین دارودرەختی چڕەوە دەورە درابوون، ئاوبارێکی خۆشی هەبوو، دارتووێکی زلی لێ بوو، لەژێر سێبەری ئەو درەختانەوە دادەنیشتن، خۆشترین ڕۆژانی ژیانی منداڵێتی خۆم بەسەربردووە، ئێمە پێمان وابوو کە شوێنی وا خۆش لەسەر زەویدا نییە، هەر لەنزیک ئەو گومەزانەوە چەندین کوپەی گەورە گەورەی سەر بە قەوزەی کەسک هەبوون کە بۆ چەندین ساڵ لە مەوپێش دەگەڕانەوە ئاومان تێدا دەخواردەوە ئای لەو ئاوە شیرینە... ئای کە ئاوێکی شیرین و خۆش بوو، پێمان وابوو ئەو ئاوە لە بەهەشت هاتووە، ئێمە هەمیشە لەتەک ئەو کوپانەوە دادەنیشتین، ئەو گومەزانە بەوەی کە چەند گۆڕێکیان تیا بوو زۆر موقەدەس خۆیان دەنواند،



هەمیشە لەبەر چاوی ئێمەدا وەک ئەفسانە وابوون کە نەماندەوێرا بچینە ژووریانەوە، بەدرێژایی ماوەی منداڵیمان وەژووریان نەکەوتین، مام سەعیدیش، کە مجێوری ئەم گومەزانە بوو یاخود زێوان بوو، ئەویش هەر پیاوێکی ئەفسانەیی بوو پیاوێکی پیری خوداپەرست بوو، هەمیشە بەدوای ئێمە دەکەوت نازانم بۆ ئەوەندە سایەدی ئێمە بوو، ئەم گومەزانە جێگەی زیارەتی خەڵک بوون، جێگەی گەلەکۆیی منداڵان بوو، کە ئێستێ بیری لێ دەکەمەوە تێدەگەم چەند خۆش بوو خودایە، ئێمە کە دادەنیشتین (یاسین) کە هاوڕێی منداڵیم بوو هەمیشە جگەرەی عارەبی لەباوکی دەدزی ئێمەش بە دزییەوە دەمانکێشا، ناوەناوەش پیاوانی وەک مام برایم کە هەمیشە دار جگەرەو شتی دیکەی لەدار دروست دەکرد و حاجی سۆر کە تەبیبێکی میللی بوو، حەسەنە گەورەو درێژ (لە شیعرێکما بەناوی غۆما باسم کردووە) هێدی هێدی دەهاتنە بەر سێبەرەکە و ئیدی کۆڕی قسە گەرم دەبوو، ئێمەش بەدیاریانەوە دادەنیشتین، مەلا سابیر پیاوێکی شەلەی قورئانخوێن بوو ڕۆژانە خاوەنی گۆڕەکان دەهاتن و مەلا سابیریان ڕادەسپارد تا بەسەر گۆڕەکان بخوێنی، ئیدی هیچ کاتێ ئەو کابرایەمان بەبێ خوێندن نەبینیوە... لەو سەردەمەدا دایکم کارێکی باشی کردووە کە هەمیشە سەری منی سفر کردووە هەرچەند موعاناتێکی زۆرم بەو سەرە سفرەوە بینیوە، هەر کات دەچوومە ناو منداڵان یەکسەر دەیانگوت و هاواریان دەکرد.

"کودیلەی ئاوێ باوێمە ناوێ"

یاخود:

"کەچەڵ... کەچەڵ قاقا سەری بەسماقە"

باشترین جوێنێ هەمان ئەو سەردەمەی منداڵیم ئەو نەزمە بوو کە تەواوی منداڵان بە کۆرس دەیانگوتەوە:

هەڵت دەگرم دات دەنێم
لەناو جۆڕکی کات دەنێم
هەتا دەمرم تێت دەنێم

٨

یەکێ لەو شتانەی کە هەمیشە داخی بۆ دەخۆم ئەوەیە کە من لە منداڵێتی لە گەڕەکێک بووم، منداڵان جگە لە (دار لاستیک) هیچ شتێکی دیکەیان نەبوو، منیش

یەک لەوان بووم- باران بڕەیێکی- هێجگار زۆرم بەردباران کردووە، ئێستاش وەبیرم دەێتەوە ئەو باران بڕانە هەموو لە ئاسمانی سەر قامیشەلانی- مام خاڵند- کە ئەویش تەبیبێکی میللی بوو خەڵکی موکریان بوو، پەڕیبۆوە هەولێر و ئەم قامیشەلانەی چاندبوو، کۆ دەبوونەوەو کاتێک وەبەر گوللەبەردینی منداڵان دەکەوتن چۆن چۆنی لەو تاقەوە سەراو سەر دەکەوتنە سەر زەوی و باڵی ڕەشی خۆیان لە تاوان پان دەکردەوە، خودایە لەمنداڵان ببوورە ئەوان گوڵی نێومەلەکوتی تۆن ئەوان بێگوناهانە لەززەتیان لەو تراژیدیایە وەردەگرت...من نازانم بۆچی بەرائەتی منداڵی بەو هەموو پاکییەوە هەڵگری ئەم هەموو زوڵمە بوو بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن.

٩

ئێمە خانووێکمان هەبوو لە قوڕ، پەڕپووت، شەوانی هاوینان کە دەچووینە سەربان، ئێواران زوو دەیانڕشاند بۆنێکی هێجگار خۆش لووتی دەپژاندم من ئەوەندە شەیدای ئەو بۆن و بەرامەیە بووبووم ئەمێستاش کاتێ باران یەکەم پەڵەی بەرخاک دەکەوێ دەگەڕێمەوە ناو کێشوەری هەمان ئەو بۆنە ئەزەلییەی خاک و هەمان ئەو لەززەتە پڕشەوقەی کە لە سەربانەوە هەستم پێدەکرد، ئیدی شەو دادەهات و هەموومان بەڕیزە دەنووستین ئەوەشم لەبیر نەچێ هەمیشە شەربە ئاوێکی سارد بەسەر لێواری ستارەوە بوو، ژیان سادەو ساکار بوو، بەر لەنووستن خۆشترین یاری من و براکانم کە سەیری ئاسمانی شین و زیوینمان دەکرد ئەوە بوو کە دەمانگوت:

"ئەستێرە پەنگەستێرە
ئاگرەکی باوێ ئێرە"

بەڵام ئێستاش لەوە نەگەیشتووم مەبەست لەو عورفە منداڵییە چی بوو، ئەو ئاگرە چی بوو داوامان دەکرد، پێمان وابوو ئەگەر ئەو ئاگرە بکەوێتە سەربانی ئێمە خانووە قوڕەکەمان دەبێتە کۆشکێکی خۆش و وڕووناک و ڕەنگاوڕەنگ و شانشین... ئێمە وامان لێکدەدایەوە .

ئەمە جگە لەوەی هەمیشە چاوەڕوانی بەیەکاچوونی هەردوو ئەستێرەی (لەیل و مەجنون) بووین و پێمان وابوو ئەگەر ئەو دەمی کە خۆیان لێکدەدەن هەر دوعایێ



بکەین خودا قەبوڵی دەکات... ئای کە خەیاڵیی خۆشی بۆ دروست دەکردین... جگە لەوەش یەکێکمان دەیگوت ئەستێرەیەک بۆلای چیا دەچێ ئەوەی بیبینێتەوە نۆرەی ئەوە پرسیار بکات ئیدی تا خەوتن هەر ئەوە بوو... بەڵام لێتان ناشارمەوە لە هات و چوونی ئەو ئەستێرانە لێکدانەوەم دەیبردمە خەیاڵێکی شیرینەوە. خەیاڵێک ئەگەر ئێستاکێ هەمبێ وەلێ بەهەمان ئەو گوڕو قووڵییەوە داهێنانی گەورەی لێ بکەوێتەوە.

من لە منداڵی زۆرم حەز لە تۆپانێ بوو، هەموو ئێوارەیەک لەبەر تۆپانێ من درەنگ وەختان دەچوومەوە ماڵ و هەموو ئێوارەیەکیش چینە لێدانێکی باشم دەخوارد، هەڵبەتە هەر لەبەر خاتری ئەوە بوو کە من بخوێنم، بەڵام هەمیشە بۆ ئێوارەی داهاتوو دەچوومەوە تۆپانێ دەشمزانی کە دەچمەوە جەمێک ئازار دەخۆم...

١٠

بیرم دێ زستانێکی تووش بوو من هەمیشە زوو دەچوومە قوتابخانە، کە دەچووم هێشتا کەسێک نەهاتبوو بۆ دەوام، ڕۆژێکیان کە گەیشتمە پۆلەکەی خۆم دنیا هێجگار سارد بوو، کرێوە بوو، بینیم کەوێکی زۆر جوان هاتۆتە ناو پۆلەکەوە، ئێدی منیش کتێبەکانم تووڕهەڵداو دەرگام داخست و کەوتمە دوای کەوە جوانەکەوە... هێندە بەدوای کەوتم و سووڕامەوە بە ناو ڕەحلەکاندا، ئیدی سەرما نەما... هێندە هیلاک و شەکەت بووم کەوتم و کەوەکەش لە من هیلاکتر بوو، ئەن ئاخیری کەوەکە کەوتە ناو تەنەکەی زبڵەکەوەو گرتم، لە باوەشی خۆم نا، گوێم لە خورپەی دڵی دەبوو، ماوەیێکی باش دانیشتم، بیرم دێ کەوەکە زۆر بەهێز بوو و خۆی ڕادەتەکاند، کتێبەکانم هەڵگرت و گەڕامەوە ماڵ کە گەیشتم لەناو بۆڵەبۆڵی دایکم و هات و هاتی منداڵان خۆم کوتایە ژوورەوەو درگام پێوەدا، کەوم بەرهەڵلای ژوور کرد بێئاگا لەوەی کە کەوەکە باڵی هەیە و دەفڕێ، هەر ئەوەندەم زانی لە شەققەی باڵی دا و لە کونێکی گەورەی سەر دەرگادا چووە دەرەوە ڕامکرد و ڕامکرد، بەڵام بێ فایدە بوو، ڕووەو شاخ ئاسمانی شەق دەکرد، تا لە هەتەری چاو ون بوو... ئێستاکەش دڵم لەگەڵ ئەو کەوەدا چوو و نەگەڕایەوە، ئەو دڵەی کە ئێستا هەمە هەمان ئەو دڵەی جاران نییە کە کەوەکە بردی هەر بە یادی ئەم کەوەوە دوای سی و دوو ساڵ شیعرێکم نووسی بەناوی- بریقەی زیوێ- کە لە گۆڤاری ڕامانی ساڵی ٢٠٠٥ بڵاومکردەوە.

١١

ئێستێش نازانم لە سۆنگەی چی بوو شەڕێکی ئاوا پڕ لە ڕقو تووڕەیی لەمیانی تەیراوە و منداڵانی قەڵا ڕووی دەدا، کە هەموویان منداڵی ئەو شارە خەمگینە بوون، ئایا جیاوازی شوێن بوو، جیاوازی ئابووری بوو، یا جیاوازیێکی شاراوە کە ئێستە دیاردەکانی بۆتە واقیعێکی سەخت خەریکە گرفتاریمان بۆ دروست دەکات!!! ئەسکەندەر ناوێک کە سەرپەرشتی تەواوی منداڵانی تەیراوەی دەکرد، بەڕاستی ئەسکەندەری مەگەدۆنی بوو، لەبەر چاومە تا نیوەی قەڵا خۆی و چەکە قوڕسەکەی کە بەردەقانی بوو هەڵدەکشا ئیدی ئێمەش هەموومان بەدوای دەکەوتین، هێزێکی سیحراوی لەناو جەستەی هەمان ئەو ئەسکەندەرە بوو، هەمان ئەو هێزەش وای کرد ئەسکەندەر بە گەورەیی لە شۆڕشدا شەهیدبێ، ئەوانەی سەرقەڵا کاریان ئاسان بوو هەر بەردێ هەڵیاندەگرت ئەوەندە بەس بوو لەدەست ڕەهای کەن ئیدی وەک بارانی بەهار دادەبەزییە سەرمان، لەهەموو شەڕەکان ئێمە بەناچار بەزیو بووین، خودایە زۆر دەترسم بە گەورەییش لەحاڵی حازر لە بەرامبەر ئەو سیحرە هەر ببەزین، ئەم شەڕە هەفتەی سێ تا چوار جار ڕووی دەدا هەڵبەت لەهەموو دەوروبەریش... لە گەڕەکەکانی دیکەش هێزی یەدەگی منداڵانمان بۆ دەهات، بەڵام ئەسکەندەری مەگەدۆنی خۆمان هەر نەیتوانی ئەهرامەکانی قەڵا بگرێ هەر بەم یادەوەش دوای سی و یەک ساڵ شیعرێکم بەناوی، (بەیەکەوە پیر بووین قەڵا) نووسیو لە گۆڤاری بارش بڵاووکردەوە.

١٢

دایکم پیاوێکی مەزن بوو، لەهەمان کات ژنێکی مەزنتر بوو، هەمیشە داوای لە ئێمە دەکرد کە کار بکەین، ئەو دەیزانی برینەکە لە کوێیە، خوا قەبوڵ ناکاتیش کە مەکتەب دادەخرا دەستم بەکار کردن دەکرد... زۆربەی کارەکانی من بەو منداڵییە هەڵگرتنی زەمبیلێکی بچووک بوو، یا سینییەک پاقلاوە، یا سەبەتەیەک سەمونی بەکونجی یا سینییەک کێکی عەینەگ یا سابونی حەلەب، فرۆشتەنییەک و کاسبیێ نەماوە من لە منداڵیدا نەیکەم، بۆیاغچی بووم، گوڵەبەڕۆژە فرۆش بوویم، لەوزینە و گەزۆم فرۆشتووە، سێ گەز لاستیک بەدرهەمێک، سێ پیاڵە بە دینارێک دواجاریش



فرۆشتنی شەکرلەمە و پندرلی... لێتان ناشارمەوە لە فرۆشتنی خواردەمەنی لەبەر نەفسنی خۆم هیچ قازانجم نەدەکرد، لەهەمووی سەیر تر ئەوە بوو زۆر لەزەتم لەوە دەکرد، کە دەچووم بۆ عەنکاوە، یا ناو کۆڵانە تەنگ و تریسکەکانی قەڵات، من بە منداڵی عاشق بووم، کچی هێند جوانی لێ بوو، کە لەو تەنگستانە دەهاتنە سەر سینی و زەمبیلەکەم، منداڵییان لێ دەستاندم و شەوانە لە عیشقی هەرزەکارانەی ئەوانە هەر زوو دەکەوتم و لە خەونا تۆڵەم لێ دەکردنەوە، هیچ کۆڵانێکی عەنکاوەو قەڵا نەماوە من شارەزای نەبم، ئێستاش نازانم بۆ هەمیشە لەبەر ماڵی کچێ کە نە سیمایم لەبیرەو نە ناویشی تەنها شوێنی ماڵەکەی نەبێ، دەوەستام هاوارم دەکرد...

المدرسة الخالدية... نەچارێ نەدووان نە سەدان، خودایە ئەم- المدرسة الخالدية دەبێ چ مەبەستێکی منی لە خۆیدا هەڵگرتبێ؟ ئاخر عەشقی منداڵانە لە کوێ و دەستەواژەی- المدرسة الخالدية- لە کوێ؟!...

١٣

نایف کوڕێکی قشت بوو، بیست و چوار سەعات بەیەکەوە بووین... تەنانەت لە نان خواردن و شەڕو پیاسە و بە چۆڵ کەوتن و گریان و پێکەنینیش هەر بەیەکەوە بووین... بەیانی سەرو سەموونی عەسکەریمان کڕی بوو، ئەوکات نیوەی تەیراوە لەسەر ئەو سەموونە دەژیا کە کەناسەکان لە ئۆردی دەیانهێناوە... بۆ ئەوەی کە لە مەکتەبە بگەڕێینەوە یەکسەر بۆ تۆپانێ بچین، بەڵام بەرلەوەی لەیەک دابڕێین بەرەو قوتابخانە بچین، هەر بەیانییەکەی نایف کەوتە بەر تایەی تراکتۆرێک و گیانی سپارد، بە مەرگی نایف منداڵێتی من بۆ ماوەیەک کوژایەوە...

نەک هەر بۆمن بەڵکو بۆ هەموو منداڵان،... لەگەڵ مەرگی نایفدا و بینینی چۆنیەتی هەڵگرتنی تەرمی نایف... ئیدی هەموو شتێک لە منداڵێتی من سڕایەوە، ڕۆحم پڕ بوو لە هەڵلاو پرسیار کە تا دەمی هەرزەکاری نەبڕایەوە...

١٤

لە هەمووی سەیرتر شەوانە کە دوای هەموو ماندووبوونێک جێگایان بۆ ڕادەخستین زستانان لەبەر دلۆپەی باران ژوورەکەمان هەمووی دەکردە قاپ و قاچاغ

تکە تکی دڵوپەگوێییێکی موزیقی بۆ من پەیدا کردبوو، چونکە ڕیتمی دڵۆپەی بن ساپیتەش ئاوازێ بوو، دایکم هەموومانی لەیەک ژوور دەخەواندو ژوورێکی گەورەمان هەبوو، بەڕێکی ڕەقی گەورەی بەسەر هەمووماندا دادەدا، جا سەیرەکە لەوەدا بوو ئەم بەڕە وەک تەلەفۆن وا بوو هەرکە لەو سەرەوە یەکێکیان نینۆکی پێدا دەهێنا ئیدی دەنگەکە دەگەیشتە ئەو سەری، هەریەکەش لە شوێنی خۆی ناوە ناوە ئەم کارەی دەکرد ئیدی تا درەنگە شەوان خەومان لێ حەرام دەبوو...

١٥

باوکم لەنێو پانتایی ئەو دەشتە غەریبەی قەرچووغ دایکمی لە سەدە زۆر دوورەکانی ناو کوردا لە چاو ئێستا بە عاشقی هێناوە کە بندیان بووەو بە ئەسڵ وەک تەواوی کورد موسڵمان نەبووین و بوونەتە ئیسلام، تەنانەت تا ماوەیەک تەواوی بندیانەکان میانەیان لەگەڵ باوکم نەبوو، هەر خۆی ئاشقی عیلم و مەعریفەت بووە کە دایکیشم زۆر پڕ لە مەعریفەت بووەو کوردی زانیوەو خۆی فێری تورکییەکی باشیش کردووەو تەواوی قورئانیشی لە هەوەڵەوە تا ئاخیر ئەزبەر کردووە... سەیرە باوکی دایکیشم پیاوێکی نوورانی پڕ لە حەکایەت بوو لە بەنی قەومی خۆی نەدەچوو کە ناوی عەولای کارەسول بووە (عبدالله کارەسول) لەبیرمە کە دەهات ئێمە چەند دڵخۆش دەبووین کە بەو ڕدێنی سپی و ساف و نوورانییەی ئەو هەموو شتە جوانانەی دەگێڕایەوە، خەزنەیەک بوو بۆ کورد، بەڵام ئاخ مرد و هەمووی لەگەڵ خۆی بردە گۆڕ، سەیرە باوکم هەتا مابوو وەک دەگێڕنەوە بەشەو و ڕۆژ زیاتر لە دوازدە سەعات موتاڵای دەکرد کە ئەوی دەمێ موتاڵا کردن بەو مەودا درێژەی هیچ مانایێکی بۆ خەڵک نەدەدا، من کە ناتوانم باسی باوکم بکەم لەبەر ئەوەیە من هەستی بینینی باوکم نییە، دەتوانم بڵێم نەمدیوە، شێوەی، ئادگاری، ڕۆیشتنی، دانیشتنی، خواردن و تووڕەبوونی، دڵخۆشی و شادی و خەمباری... هیچی لێ نازانم... کەسەرێکی گەورەیە کەسێک باوکی خۆی نەبینێ– بەڵام ئەوەی کە دەیگێڕنەوە سەبارەت بە باوکم ئەوەیە مرۆڤێکی هەتا بڵێی زیرەکو چاونەترس و دژە ئاغا بوو.



## لە وەهمە جوانەکانی منداڵییەوە بەرەو ژیان

١

ئەوەبوو پۆلی شەشەمی سەرەتاییم هەر لە قوتابخانەی مەولەوی تەواو کرد، ئەو قوتابخانەیەی کە یەکەم قۆغە شیری شیعری پێ بەخشیم، ئەوەیش خوێندنەوەی شیعرەکانی مەولەوی بوو، بەڕاستی حەقیقەتێک هەیە دەبێ فێری نەوەکانی خۆمانی بکەین، ئەوەیش ستراتیژیەتی ناولێنانە، ناو زۆر گرینگە و کاریگەرێتی زۆری هەیە، نموونەشم بۆ ئەمە هەمان ئەو پەیوەندییەی منە بۆ شیعرەکانی مەولەوی، لەرێگەی ناوی ئەو قوتابخانەیە بوو، خواحافیزیم لەو قۆناخە کرد و هەرچی مامۆستا و کورسی و تەختەڕەش و دەرو دیواری پڕ لە نووسینی سەیرو سەمەرەو ئەو تانکییە ئاوە گەورەیە کرد کە لەکاتی ئەو قۆناغەدا دوعای ئەوەمان دەکرد کە خودایە ئەم تانکییە ئاوە بتەقێت و بەڵکو بۆ چەند ڕۆژێک قوتابخانەکەمان پڕ لە ئاو دەبێ و دەوام نابێ، ئەمەمان لەدڵەوە بوو، خەیاڵی منداڵیمان بوو، بەڵام قۆناغی سەرەتاییشم تەواوکرد و ئەو تانکییە هەر نەتەقی... ئیدی لە کۆتاییەکانی ئەو قۆناغەدا دوا ڕۆژی هەفتەی پاک و خاوێنی دەستی پێ کرد، پێم وایە خۆشترین و پڕ بۆن و بەرامەترین چالاکی منداڵێتی لەم قوتابخانەیەدا هەفتەی پاک و خاوێنی بوو، ئیدی قوتابخانە ئازیزەکەمان دەبوو بەیەک پارچە دارستان و سەوزایی و گوڵ و گوڵگون، حەوشەی بەردەم دەبوو بەیەک پارچە پاکی و بۆن و بەرامەی سنەوبەر و چنار و لاولاو، خودایە ئەم بیرەوەرییانە بۆ هێندە خۆش بوون، بۆچی و لە پای چی تەزووی دڵنەوایی دەبەخشنە جەستەمانەوە، دوای ئەو هەموو ساڵە... قوتابخانەکەمان دووقات بوو، جار جارە لە قاتی سەرەوە تەیارەمان لە کاغەز دروست دەکرد و بەرهەڵلای ئاسمانمان دەکرد، چەندین خەیاڵی ڕەها ئامێز ئارەزووی ئەوەی پێ دەخواستین کە بریا لەنێو ئەو تەیارەوە ئێمەش بەرهەلڵای ئاسمانی شین بووینایە و بۆ ساتێ لە بویەری قوتابخانە ڕزگاریمان دەبوو.

## ٢

لەبیرمە کە من هێندە تەمبەڵ بووم لە دەرسی حیساب، پێم وابوو ئەم دەرسە کەڵکی مرۆڤایەتی نییە، ئەوکات پێی نەدەگوترا بیرکاری ڕادەی تەمبەڵیم لەدەرسی حیساب یەکجار باڵا بوو، هیچم نەدەزانی و مەحاڵیش بوو فێربم و تاماویشم هەر لە بیرکاری تەمبەڵ دەبم، جارێکیان مامۆستا ئیبراهیم ماوەرانی خودا بەهەشتی بەنسیب بکات، هەڵیساندم و گوتی: ئایا ڕووبەری بازنە چۆن دەردێت؟ لەبەردەم تەختە ڕەشەکەوە وەستابووم، بەڵام چەندم بیرکردەوە نەمزانی... ئیدی زۆر تووڕە بوو، هاتە نزیکمەوەو بە هەموو هێزێکیەوە تیواو تیو بەدەستی ڕاستەی کارتێکی لە نیوەی سەرم داو گوتی:

نیوەتیرە... کارتێکی دیکەشی خزاندە سەرم و گوتی نیوەتیرە جارانی نیوتیرە هەمدیس کارتێکی دیکەشی کوتا جارانی ٢٢/٧ نازانی...؟ من لە شوێنی خۆم وڕوگێژ بووم، سەرم لەقی، بە دەوری خۆم سووڕامەوە و چاوم کەوتە ڕەشکەو پێشکەو کەسم نەبینی ئێستاکێ بیر لەو ڕەفتارەی ئەو مامۆستا باشە دەکەمەوە دەڵێم خودایە بۆ ئاوەها توندوتیژ بوو لەگەڵ مندا؟ بۆچی هەوڵی نەدا بە ستایلێکی ڕوون و جوان لە منی بگەیەنی، بۆیە زۆرجار دەگەمە ئەو ڕاستییە هەندێ کەس ڕەگەزی ئەو توندوتیژیەیان لەگەڵ خوێنی خۆیاندا هێناوە خەتا لەوان نەبووە خەتا لە پەروەردەی پێشینی ئەوان بووە.

## ٣

ئیدی ئەو هاوینەی کە چیاکانی قەرەچووغ نوقمی لێکدانەوەی ئەبەدی کردم، کۆتایی بە قۆناغێکی ژیانی منداڵێتیم هێنا، ئەو قۆناغەی کە پڕە لە خەونی ڕەنگاو ڕەنگ و وەهمی شیرین شیرین، تەنانەت دەکرێ بڵێم قۆناغێکە لە دەرەوەی سنوورە دوور دوورەکانی خەیاڵ ئەو سنوورانەی منداڵ پێی وایە دەستگیر دەکرێ و دەستبەرداریان نابێ، بەداخەوە گێژاوی نەهامەتی و مەینەتییەکانی ئێمە وای کرد کە من خۆم لانی کەم نەتوانم ئەو هەموو گەوهەرە پڕ بەهایانەی، ئەو گەوهەرە جوان جوانانەی ژێر لیتاوی ڕۆژگاری منداڵێتی بدۆزمەوەو تۆماریان بکەم. ئێمە میللەتێکین





لە ئەزەلەوە زاکیرەمان بێ هێز کراوە، بەرهەحاڵ قۆناغی خەون و خەیاڵ کۆتایی هات و قۆناغێکی دیکە دەستی پێکرد.

ئیبراهیم ئەمین باڵدار کە لەناو زەینی یەک ملیۆن مرۆڤدا جاویدانی... ماڵاوا مامۆستای حیساب... ماڵاوا مامۆستا جوانەکانی قۆناغی سەرەتاییم، کەماڵ مستەفا، بەتروسە فەندی جوبرائیل، موحسین، تاهیر، سەلاح سوار فەندی، ئەسوەدە فەندی... ئەگەر ماون ئەوە چاوم هەر پێتان دەکەوێتەوە کە بۆ ئەبەد سەری ڕێزو نەوازشتان بۆ دانەوێنم... ئەگەر کۆچیشتان کردووە، گەردنتان ئازادو بەهەشت جێتان بێت.

## ٤

بەم جۆرە لە دەرسی حیسابی شەشی سەرەتایی بە نمرە ٥٠٪ ڕزگاریم بوو، کە پێم وایە ئەو نمرەیەش هەمووی هی من نەبوو برێکی بە بەزەیی و یارمەتی بووە... ئیدی قۆناغی- بیض اللگلگ- و قاویتی دوای هەڕەشتە سوورکردنەوەو پندرلی و لەوزینەو عەسەلیات تەواو بوو، پێم نایە قۆناغێکی دیکە کە قۆناغی ناوەندی بوو، ئەوکات ناوەندی بە عەرەبی بوو هێشتاکە نەبووبووە کوردی، بۆ ئێمەش ئەزموونێکی تفت و تاڵ بوو، چونکە هیچمان نەدەزانی لە زمانی عەرەبی، شڕو شەپڕێو بووین، ئەو قوتابخانەیەی من تیایا وەرگیرام لەسەر ڕێگای عەنکاوە بوو، تازە دروست کرابوو، زۆربەی قوتابییەکان هی گوند و لادێکانی دەوروبەری هەولێر بوون، تایبەتمەندێتی زۆری هەبوو، سەیرەکە لەوەدا بوو هەموو بەیەکەوە هیچمان نەدەزانی، هەرچەندە من و چەندانێکی دیکە خەڵکی شار بووین، کە ئەوکات هاشم سەڕاجی شاعیر و قەرەنی جەمیلی هونەرمەندو حەمید جەمال و عەبدوڵڵا ڕەسولی هونەرمەندیش لەگەڵ مندا بوون، هەروەها مامۆستا سەلاح سەعدی بەرێوەبەری قوتابخانەی برایی بوو پەروەرشکارێکی مەزن بوو، مامۆستای ئینگلیزیشمان ئیحسان ناوێک بوو، بەڵام من هەمدیس کەوتمەوە بەر تیری ڕۆژانەی دەرسی حیساب کە ئەویش جەبرو هەندەسە بوو... موعاناتێکی زۆرم لەگەڵدا چەشتبوون هەربۆیەش ڕۆژانە ئەو قسەیەم دووبارە دەکردەوە کە نازانم کێ گوتوویەتی:

مەدرەسە خۆش مەدرەسە

بدون جەبرو هەندەسە

مامۆستای کیمیامان پیاوێکی قسە خۆشی سوحبەت سازبوو هێجگار پڕ نوکتە و پێکەنین بوو، زۆربەی قوتابییەکان حەزیان لە دەرسی ئەو بوو، هەمیشە دەفتەرێکی بچکۆلانەی لە دەستدابوو، تێبینییەکانی خۆی سەبارەت بە قوتابییەکانەوە تیادا دەنووسییەوە، چاوی شین بوو، ڕۆژێکیان تاقیکردنەوەی کیمیامان ئەنجام دا، دوای ئەوەی کە وەرەقەی تاقیکردنەوەی هێنایەوە و بەر لە دابەشکردن گوتی (بەکر ڕەحمان) کێیە؟ ئەویش وەڵامی دایەوە و گوتی منم، وتی گوێ بگرن بزانن ئەو برادەرە چی نووسیووە "نأتی بعصفور ونضعه تحت ناقوس زجاجی" ئەو قوتابییە لەجیاتی وشەی (فسفور) نووسیبووی (عصفور)، هەموو کەوتنە پێکەنین، بەڵام مامۆستا صائب بۆی بە هەڵە حسێب نەکرد و گوتی خەتێکی خۆشی هەیە و بۆ ئەویش نوێیە، بەڵام دەبێ بزانێ (عصفور) لەژێر ناقوس ناژیت و دەمرێ.

٥

ئەوێ وەختان کە ئێمە پێمان نایە ئەو قۆناغە بارو زرووفی کورد تارای تازەی بەیانی (١١)ی ئاداری دەپۆشی و وەرچەرخانێکی بەخۆوە دەبینی. هەر لەگەڵ دەرچوونی ئەو بەیانە لەلای ئاقاری قوتابخانەکەمان ئەوکات چۆل و هۆل بوو بە درێژایی چەند میل و میلێک بە شایی و هەڵپەڕکێ و ئاهەنگ داپۆشرا، هەر لە شایی دەڤەری بادینانەوە تا دەگاتە ئەوپەڕی هەورەمانەوە لە هەموو لایەک گۆرانی و مۆسیقا و هەڵپەڕین و دروشم چڕین بوو، ئەو ناوە کەرنەڤاڵێک بوو لە تەقینەوەی عەشق و کوردایەتی ڕاستەقینە و ئازادی خواستن و شانازی کردن بە پێشمەرگە و خەبات، ئێمە کە ئەو دەم لە قوتابخانە بەردەبووین یەکسەر بەرەو ئەو کەرنەڤاڵە دەچووین... ئەوێ یۆتوپیایەک بوو ئێستا وەک خەونێک دەبریقێتەوە، زۆرجار لەلای شایی خەڵکی هەورامان دەوەستاین جۆری شایی و هۆرەکانی ئەوان بۆ ئێمەی منداڵ شتێکی دیکە بوو، وەک هی لای ئێمە نەبوو، چەندین سەعات و سەعات تا درەنگە شەوان لەو ئاقارە پڕ حەشامەتە دەماینەوە خودایە ئەو خۆشی و شادییە بۆچی لەسەر خاکی ئێمەدا دووبارە نەبۆتەوە؟ ئایا دووبارە دەبێتەوە؟!.



لەنێو ئەو ئاهەنگە سیحراوییەدا هەموو شتێک هەبوو، من بەوەی کە هەر لە منداڵییەوە هۆگری شیعر بووم، شیعرێکی زۆری کامەران موکریم لە بەربوون، گوڵاڵە سوورەی ئەو شاعیرە کتێبی شۆڕشگێڕان بوو، کتێبی بەرباخەڵی پێشمەرگە بوو، من نزیکەی هەموویم لەبەر کردبوو جار جارە خەڵکی کۆدەبوونەوەو یەکێکیان بەرز دەکردەوە هوتافی بۆ خەڵک دەدا، منیش یەک لەوانە بووم، تا جاری وابوو ئەوەندە بەهێز هاوارم دەکرد و شیعرم دەخوێندنەوە ئێوارە کە دەچوومەوە نووسکەم لێوە نەدەهات و تەواوی ژێکانی گەرووم لە گۆ دەکەوتن و وەکو (دارکون کەرە) کە ئەوەندەی دەنووک لە درەخت دەدا دەنووکی داغ دەبوو بڕیاری دەدا کە چیدیکە دووبارەی نەکاتەوە، بەڵام کە سپێدە دەهات دووبارە دەکەوتەوە کوڵینی درەختەوە منیش دەق ئاوەهابووم. بەتایبەتی ئەو پارچە شیعرەی کامەران کە دەڵێت:

گوێم بەدەنگی ئاخ زرینگایەوە
دەمم بەهاوار هەڵێنایەوە
بۆیە هەر ئەبێ پشکۆی تۆڵەبم
قوربانی خاک و هی ئەم خۆڵە بم

ئیدی دەبوو بە چەپڵەو هاوار منیش لەگەڵیا باڵام دەکرد و لە ناخەوە شانازیم بەخۆمەوە دەکرد.

زۆربەی دروشمەکانی ئەوکات گوزارشتی لە خۆشەویستی پێشمەرگە و بارزانی نەمر دەکرد، دروشمەکان ئەوانەیان ڕەت دەکردەوە کە دژی خەباتی گەلی کورد بوون، یا خیانەتیان لەگەڵ خۆیان کردبوو، جا زۆرجار دروشمەکان بۆ ناشیرین کردنی ئەوانەبوو کە دژی میللەتەکەی خۆیان دەچوونە سەنگەری دوژمنانەوە و هەریەکەو دەلالەتی خۆی هەبوو ئەوە چەند دروشمێکی ئەو سەردەمەیە کە من ناوی دەنێم دروشمە هوتاف. بۆ نموونە:

"بژی بابی لوقمانی
شەش خەریتەی لە شانی"

"کێتان دەوێ لە کوردان
مەلا مستەفای بارزان"

هەندێکی دیکە لەو دروشمانە دژی جاشەکان بوو، بۆ نموونە:

"پێشمەرگەی ناو تەڕاشان
کیریان بەقوونی جاشان"

ئەوکات کە ناوی پۆلیس دەهات زیاتر ڕق بوو بۆ مێژووی پۆلیسە حەرەس قەومییەکان...

"نەجاشم نە پۆلیسم
کوردەکی زۆر موخلیسم"

هەروەها ئەمەش دەگوترا:

جاشەکان ئەمڕۆ بەجارێ ڕووڕەشن
قوڕ بەسەر گەورە و بچووکیان
ئینجا بۆ کوێ دەردەچن...

کاتێک دروشم چڕەکان کە ئەگەر هەڵپەڕکێی کچانیان لا نزیک بوایە، دەکەوتنە شایی و بەم چەند دێڕە گوزارشتیان لە ناخی خۆیان دەکرد:

"فاتمێ زاڵمێ بارزان ئەمرەکی دایە
فاتمێ زاڵمێ نەختی کیژان نەمایە"

گەنمی قەراجی وردە مەلا مستەفا زەعیمی کوردە

ئیدی لە هەموو لایەک ئەم بەزم و ڕەزمە بەردەوام بوو، وای خودایە ئەم کەرنەڤاڵە لە بەهەشت بوو یا لە خاکی زیندووان؟ کە ئێستا وەک تاوسێکی ڕەنگاو ڕەنگ و وردە وردە لە ناو تەمی بیرەوەرییەکاندا دوور دەکەوێتەوە لە هەڵمی لەبیرچوونەوەدا ون دەبێ.



## لە ژیانەوە بەرەو سەختەندازەکانی شاخ

### ١

قۆناغی ناوەندیم تەواو کرد. ئەو بەری شەقامی شەستی هێشتا سەر پاکی کێڵگەی گەنم و جۆ بوو، کە ئێمە هەمیشە لەناو ئەو کێڵگانەدا دەمانخوێند، ئێستا بەوە کەوتووم کە قوتابی لەناو سروشتی خوداییدا ئەوەندەی فێری کرێشمەو ڕامان دەبێ، ئەوەندە فێری وانەکانی قوتابخانە نابێ، زۆر جاری وابووە، کە وانەی جوگرافیام دەخوێند و سەیری ئەو سروشتە خوداییەم دەکرد، جوگرافیا دەبوو بەمێژوو دەبوو بەفەلسەفەو فەلسەفەش دەبوو بەچەند پرسیارێ کە ئێستێش پێم وایە وەڵام نادرێتەوە، کاتێکیش ڕادەچڕیم و لە ڕامانی خۆم دەبوومەوە کتێبی جوگرافیام لەژێر دەست و پێکانم دەدۆزییەوە، بەهەر حاڵ ئەو ناوە ئاوەدانی تێ نەکەوتبوو، هەمان ئەو ساتانەم لەبیرە کە کارتی نمرەکانی بەکالۆریای کلاسی سێیەمم لەدەست مامۆستای زمانی عەرەبی- مامۆستا ساڵح- کە خەڵکی هەولێر و شارستان بوو وەرگرتەوە، ئەودەم ئەو نمرەکانی ئەنجامی ئەزموونەکانی دابەش دەکرد، جا لەبەر ئەوەی وەک گوتم هێندە تەمبەڵ بووم لە دەرسی حیساب کە نمرەکانی دامەوە گوتی- ناجیح بوویت- باوەڕم نەکرد، گوتم باوەڕ ناکەم؟ من ناجیح بووبم، مامۆستا ساڵح کەوتە گومانەوەو دووبارە چاویلکەی لەچاو کردو دەستی دا مەستەرەکەو دایناوە سەر نمرەکان بۆ ئەوەی تەئکید کاتەوە، بەڵام نا بەڕاستی ناجیح بوو بووم، بەڵام ئەوەی زۆر زۆر سەیر بوو دیسان بەهەر دوو دەرسی جەبر و هەندەسە کە ئەوسا بەهەردوویان لەسەر (١٠٠) پلە بوو، وەکو قۆناغی شەشی سەرەتایی لە ٥٠٪ نمرەم وەدەست هێنابوو... هەر کە نمرەکانم وەرگرتەوە ئیدی تا ناو ماڵێ ڕامکرد. هەستم بەوە دەکرد کە من دەفڕم. فڕینێ سنووری نەبوو. خۆشییەک لەگیانمدا وەک بارانی بەهار کەروێشکەی پێ دەکردم ماندبووبوونی لەبیر دەبردمەوە. خۆشم نەمزانی چۆن گەیشتمەوە ماڵ، لەرێگەدا هەر بەدەم ڕاکردنەوە هەر ناسیاوێکم دەدی کارتەکەم

بەرز دەکردەوە و هاوارم دەکرد. ناجیح بووم ناجیح- ئای خودایە چەند بەختەوەر بووم ئەو ساتە، "بەڵام ژیان و ئەرکی ناخۆشی پەپوولەی ئارەزووی کوشتم!..." نیوەڕۆ هەموومان کەوتینە سەر سفرە بەڵام خواردنی چی... وام هەست دەکرد من هەر گەدەم نییە، حەزم دەکرد هەموو دونیا ئاگادار بکەمەوە کەوا من ناجیح بوویم.

٢

ئیدی تەواوی پێداویستییەکانی قۆناغی ئامادەییم کۆکردەوەو پێشکەشی بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەی- **الاخوة**-م کرد و بووم بەپۆلی یەکەمی ئامادەیی و لە بەشی (ئەدەبی)... داخی گرانم هەمدیس ڕزگاریم نەبوو ئەو دەرسەی کە بۆ من بووبوو بەکێوێکی سەخت و لێی ڕزگار نەدەبووم سەربارو بنباریش لۆگاریتمیشی هاتبووەسەر، کە ئەو کات چوارەم ساڵی بەیانی یازدەی ئاداربوو، بەر لەوەی ئەزموونی نیوەی ساڵ ئەنجام بدەین، بونیاتی بەیانی (١١)ی ئادار شکا، ڕژێم بەدرێژایی ئەو سێ ساڵ و نیوە هەر خەریکی کۆدێتا و قڕ کردنی کورد و شەهید کردنی خەباتگێڕان و دزینی تێکۆشەران بوو، هەموو ڕێگەیێکی دڕندایەتی گرتەبەر بۆ پووچەڵ کردنەوەی ئەم بەیانە... تا وای لێ هات سەرکردایەتی سیاسی گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە ڕژێم لە جێبەجێکردنی بەندەکانی بەیانی (١١) ئادار بەفێڵە، بۆیە لە یەک ڕۆژدا شار خرۆشا و خەڵکی بەتێکڕا ڕوویان کردەوە شاخ. ئێمەش کە قوتابی بووین یەک پارچە ڕوومان لە شاخ کرد و پۆلی یەکەمی ئامادەییمان بەنیوەچڵی جێهێشت ئەوکات، شۆڕشی کورد تەواوی قوتابییەکانی لە ئوردوگای (رواندز) کۆکردەوە کە ئوردوگایێکی سەربازی هێجگار گەورە بوو، بەسەدان ژووری تیابوو، هەموو دابەشبووینە سەر ژوورەکان، زیاتر لە دوو هەزار قوتابی بۆ ماوەی مانگێک لەم ئۆردوگایە حەواینەوە، بەڵام سەرکردایەتی شۆڕش ئەمەی بەچاک نەزانی و ئەمری کرد بەزووترین کات ئەم ئاپۆڕەیە پەرش و بڵاو بکرێت و دابەش بکرێن، چونکە هەواڵ گەیشتبوو کە ڕژێم دەست بەبۆردومانکردنی دەکات، ئەوە بوو پەرش و بڵاو بووینەوەو هەریەکەو چووینە بەشێک و هێزێک و دەزگایەک، من بەو پێیەی کە برا گەورەکەم ئەحمەد دەشتی هەر لە ساڵانی شەستەکانەوە لە ئێزگەی دەنگی کوردستان بوو، منیش چوومە ئێزگە و بەمووچەی (١٦) دینار لە ڕاگەیاندن دامەزرام



و لە بەشی کۆنترۆڵی ئیزگەی دەنگی کوردستان دەستبەکار بووم، ئیدی سەرەتای تۆفانی ڕق و قینی ڕژێم دەستی پێکردو هەموو لایەک تۆپباران دەکراین و فڕۆکەش بێ ڕەحمانە بۆردومانی دەکردین.

٣

بەم جۆرە هەموو ئێوارەیەک ئیزگەی دەنگی زوڵاڵ و ڕاستەقینەی شۆڕشی دەگەیاندە خەڵک ئەو کات هەموو بەرنامەکان تۆمار دەکران تەنها هەواڵەکان بەزیندوویی پێشکەش دەکران، من کە لەگەڵ هاشم و مەحفوز هەر شەوەی یەکێکمان خەفەر دەبووین و بەرنامەکانمان پەخش دەکرد، شەریتەکان ئەو کات بەکرەی گەورەبوون، ئەو شوێنەی ئیزگەی لێ بوو، شوێنێکی شاخاوی تژبوو لە نێوان شارۆچکەی چۆمان و مەمی خەلاندا بوو پێیان دەگوت ماخۆلان، بریتی بوو لە هەڵدرێکی سێ مەتری بەرین و (٣٠) مەتر درێژ، دیوارەکانی کۆنکریت بوون و سەریشی سەب ڕێژ کرابوو پاشان بەخۆڵ داپۆشرابوو، بە فلین ساپیتەی بۆ کرابوو، ئەوە بوو ڕۆژێک فڕۆکە بەتوبولیف، بۆردومانی کردین ئەو شەوە من خەفەر بووم تەواوی ساپیتەی فلینی ژووری کۆنترۆڵ کەوتە خوارەوە و منیش لە ژێریەوە بەتەنها مامەوە، فڕۆکەکان بێ ڕەحمانە بە- صلیە- هەر جارەی دوازدە قومبەلەی توبولیفیان دەهاوێشتە خوارەوە، هەر بە تەنها دەنگەکەی بەس بوو بۆ ئەوەی ئەژنۆی مرۆڤ بشکێنی، ئەوکات تەواوی ئەدەب و ئەدیب و ڕۆشنبیرانی کورد هاتبوونە ڕیزی شۆڕش و لە ڕاگەیاندندا کاریان دەکرد. لەوکاتە ئەوانەی کە لەئیزگە کاریان دەکرد ئەمانە بوون.

| | | |
|---|---|---|
| عبدالخالق معروف | بەڕێوەبەری ئیزگە | هەولێر |
| أمجد عبدالواحد | ئەندازیار | سلێمانی |
| دارەوان... | ئەندازیار | سلێمانی |
| احمد دەشتی | ل. هونەری | هەولێر |
| محفوز عبدالقادر | کۆنترۆڵ- پەخش | هەولێر |
| کەریم دەشتی | کۆنترۆڵ- پەخش | هەولێر |

| | | |
|---|---|---|
| بارزان مەلا خالید | بێژەری کوردی | هەولێر |
| حسن خۆشناو | بێژەری کوردی | شەقلاوە |
| دڵشاد مەسرەف | بێژەری کوردی | سلێمانی |
| رەمەزان حەمەد | کاروباری هونەری | هەولێر |
| ئیبراهیم | کاروباری هونەری | سلێمانی |
| عبدالسلام دەشتی | کاروباری هونەری | هەولێر |
| حەمە رەشید هەرەس | بێژەری کوردی | سلێمانی |
| دارا | بێژەری عەرەبی | بەغدا |
| دەنسە حەریری | بێژەری ئاسوری | هەولێر |
| ساهی | بێژەری تورکی | کەرکووک |
| یاوەر نامق | وەرزش | کەرکووک |
| ئەنوەر شێخانی | ل. فرِنی ئیزگە | هەولێر |
| کاکە لاو | پێشمەرگە لە بەشی ئیدارە | هەولێر |
| نەجات محەمەد حاجی | تۆمارچی ئیزگە | هەولێر |
| مەهدی ئومێد | بەرنامەی ئەدەب | کەرکووک |
| مەحفوز مائی | بێژەری بادینی | دهۆک |
| فازڵ قەساب | هونەر | سلێمانی |
| عبدالوهاب تالەبانی | بێژەری عەرەبی | کەرکووک |
| عبالرحمن | بێژەری ئینگلیزی | کەرکووک |
| زهیر عبدالمسح | دەرهێنەر | هەولێر |
| خەلەف زێباری یا ئاغوک | بێژەری بادینی | بادینان |
| محەمەد دشتی | ئەرشیفی ئیزگە | هەولێر |
| نەژاد عەزیز سورمێ | پەیامنێر | هەولێر |

ئەمانە و چەند ناوێکی دیکە کە ئیستێ لەبیرم نەماون لە ساڵی (١٩٧٤)ەوە تا کۆتایی نسکۆی شۆڕش لە ئیزگەدا کاریان کردووە.



## ٤

سروشتی کوردستان سەرەڕای جوانی لە ڕادەبەدەری زۆر سەخت و دژوارە بەتایبەت زستانانی کە یەک پارچە بەفرە و هیچ هۆیەکی ژیاری تێدا دابین نەکراوە، بەدرێژایی سەدان ساڵە داگیرکەران هەمیشە ویستوویانە هەر بەدواکەوتوویی بمێنێتەوە، بۆیە نە ڕێگاییێکی مۆدێرنی بۆ کراوەو نەهیچ کارێکی خزمەتگوزاری، تەنها ئەوکارانە نەبێت کە خودی شۆڕشی کورد بۆی ئەنجام داوە، سەرەڕای ئەو سەختی و دژوارییەش بۆردومانی فڕۆکەکان هەمیشە و بیست و چوار سەعات بەردەوام بوو، ئەو ڕۆژەی کە پردی گەڵاڵە بۆردومان کرا، گەورەترین کارەسات بوو، خەڵکانێکی بێ گوناهی زۆر کەوتنە بەر شاڵاوی بۆمب باران و شەهید بوون، هەروەهاش بۆمباران کردنی قەڵادزێ و کە تازە دانشگای کوردستان تیایدا جووڵابۆوە، دیسان بۆمب باران کردنی چۆمان و شارۆچکەکانی کوردستان، بەڕادەیێک بوو خەڵکی لەگەڵیان سەرەڕای مەرگ ومیر ڕاهاتبوون، هیچ شوێنێک نەبوو، کە بنگەوەرێکی گەورەی بۆ خۆ حەشاردان تیا نەبێ، ئێمە لە ئیزگە بووین، هەروەها چاپخانەش لەتەک ئێمەوە بوو دوو ژێر گەوەری گەورەی هەبوو، سەیر لەوەدا بوو لەکاتی بۆردومان کردندا هەتا سەگەکانیش دەچوونە ناو ئەو بنگەوەڕانە، جارێکیان هەرکە دەنگی تەیارە هات برادەرێک ڕایکردە بن گەوەڕەکە بەڵام کە بینی سەگەکە بەر لەو چۆتە ژوورەوە ئیدی ئەو لە بەردەم بنگەوەڕەکە هەر هاواری دەکرد. کە ڕێکەوتی جەزائیری شووم لەمیانی عێراق و شای گۆڕ بەگۆڕدا مۆرکرا کورد وەکو هەموو شۆڕشەکانی دیسان کەوتە بەر خەنجەری ژەهراوی و گەورەترین نسکۆی دروست کرد، ئەوەبوو شۆڕشی ئەیلول نسکۆی هێنا و سەرتاسەری کوردستان کەوتەوە بەردەستی داگیرکەران، هەزاران هەزار پێشمەرگە لەو سەری بادینانەوە تا ئەو سەری هەورەمانەوە بەناچاری ئەوەی گەڕایەوە شارو ئەوەی تریش ڕێی بەرەو ئێران هەڵگرت منیش ئاوارەی ئێران بووم و لە ئۆردوگای (رەبەت) گیرسامەوە کە ساواکی ئەوسا بە تەواوی کۆنترۆڵی ئۆردوگای کرد بوو، ماوەیەک لەم ئۆردوگایە مامەوە، بەڵام دژواری ژیان لەو ئۆردوگایە ئەوەندە توند بوو بەناچار گەڕامەوە شار، ئەلێرەوە ژیانی شاخ کۆتایی هات و چوومەوە ناو ڕەوتێکی دیکەی ژیانی دیلێتی و دەستبەسەری.

## ئۆردوگای ڕەبەت

دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول لە ١٩٧٥ و پەیمانە شوومەکەی نێوان سەدامی دیکتاتۆرو شای نامەرد وێڕای هەموو پێشمەرگە و خەڵکی کوردستان منیش ئاوارەی ئێران بووم، لە ئۆردوگای ڕەبەت گیرسامەوە..کە دەکەوێتە نێوان شاری سەردەشت و ئەولاتری مەهابادێ، بە مەودایێکی دوور ... خەڵکێکی ئێجگار زۆر لەو ئۆردوگایە گیرسابووەوە... بەڵام ساواکی شا وەکو مۆرانە لەو ئۆردوگایە کاری دەکرد، زۆربەی ئەوانەی کە لەو ئۆردوگایە بوون خەڵکی قەلادزێ و کۆیە و هەولێر بوون... شوێنەکە هەمووی وەکو هۆڵ وابوو لە ناوەوە دروست کرابوو بە ژوورو هەر ژوورەی ١,٥ مەتر بە ٢ مەتر بوو ژیان زۆر سەخت بوو لەو ئۆردوگایە ...خوردو خۆراک زۆر بە زەحمەت دەست دەکەوت، ئەوەش کەوا دابەشیان دەکرد بەشی خێزانێکی گەورەی نەدەکرد، لەو ئۆردوگایەدا مامۆستاییێکی زۆر هەبوون کە هەموو بێ کار لە بن دیواری ئەو قاعانە دادەنیشتن، بۆیە کەوتنە هەوڵی ئەوەی کە قوتابیەکان کۆبکەنەوەو ئیدی بە نائومێدی دەرس بخوێنن، هەڵبەت خەڵک لە حاڵەتێکی نەفسی هێجگار قورس دەژیان، چونکە تازە شۆڕش کۆتایی هاتبوو یەکێ لە بەرپرسەکان خەڵکی کۆکردەوەو لەبیرمە گوتی: کە پێشمەرگە لە زاخۆوە تا ئەوپەڕی هەورامانەوە پاشەکشەیان کردو کۆتایی شۆڕش ڕاگەیەنرا، خەمێکی قووڵ بوو برینێک بوو هەرگیز تاوەکو ئێستاش سارێژ نەبۆتەوە، لەگەڵ ئەوەش شرە ئێزگەیەک هێنرابووە ئەو ئۆردوگایەو بەردەوام سروودی شۆڕشگێڕی بۆ خەڵکەکە دەخستە سەر، بەڵام فایدەی چی نائومێدی شکستی بە تەواوی خەڵک هێنابوو، بەڵام ئەمری واقیع بوو، چونکە شۆڕش لە پشتەوەڕا خەنجەر ڕێژ کرابوو.. بەردەوامبوونی مایەی فەوتانی جەماعی بوو بەتایبەت ڕژێمی بەعس ئەوکاتە لەوپەڕی خۆ پڕچەک کردندا بوو من ئێستاش پێموایە بڕیارێک بوو جۆرێک لە حیکمەت و شڵەژاوی تێدابوو... بەهەرحاڵ چەند قوتابخانەیەکیان کردەوە لە سەرەتاییەوە تا ئامادەیی



منیش کە ئەودەم پۆلی چوارەمی گشتی بووم لەگەڵ قوتابیان لەو قوتابخانەیە دەوامم کرد.

زۆر جاران ئێواران لەگەڵ ئەو برادەرانەی کە بەیەکەوە بووین دەچووینە دەوری ئۆردوگاو دەکەوتینە قسە، ئێمە پێمان وابوو ئیدی جارێکی تر ببڕای ببڕ چاومان بە کوردستان ناکەوێتەوە، تەنانەت زۆر جار هیوای ئەوەمان دەخواست ئەگەر لێگەڕێن بچینەوە بۆ خۆمان لە گوندێکی دوور دووری کوردستان بێت بژین باشە، ئا بەم جۆرە نائومێد ببووین، تروسکاییەک لە گیانماندا نەمابوو. ژیان لە ئۆردوگای ڕەبەت بریتی بوو لە نائومێدی و نادیاری تژی برسیەتی و دڵەڕاوکێ... لە سپێدەوە بۆ سپێدە هەندێ جار دەکەوتینە وڕێنەوە، سەفەر کردن بۆ دەرەوەی وڵات سەریەشە بوو ساواک هیچ خەمێکی نەبوو جگە لە خەمی کوشتنی ئێمە بەم شێوە ژیانە، دوژمنانی کورد بە هەرشێوەیەک بێت ئامانجیان لەناوچوونی کوردە ...جا ئەگەر بۆ ماوەیەکیش لە باوەشت بگری، ئەوە لەو ماوەیەدا بەنجت دەکات... بیرم دێت هەر لەو ئۆردوگایەدا شتێکم نووسی بەناوی (کاتێک ژیان تامی نامینێ) کە تیایا باسم لەو ژیانە دەکرد کە خەڵک لە ئۆردوگا بەسەریان دەبرد، بەراوردم دەکرد لەگەڵ ئەو ژیانەی لە کوردستان لەژێر بۆردومانی (سۆخۆی ٧)دا بەسەرمان دەبرد، بەڵام چونکە ئەوێ سەر زەوییەکی داگیرنەکراوی ئازادی خۆمان بوو سەد قات خۆشتر بوو ... ڕۆژانە ساواک خەڵکیان هان دەدا کە بەرەو عێراق بگەڕێنەوە بۆ ئەم مەبەستە ماشینێکی زۆر ئامادەکرابوو ... جا کە ئومێدێک لێرەو لەوێ نەبێ مرۆڤ هەر لەسەر خاکەکەی خۆیەوە بێت باشترە، بۆیە منیش بڕیارم دا بگەڕێمەوە کوردستان، گەڕانەوەی من بۆ کوردستان لەززەتێکی زۆری تیابوو، بە تایبەت ڕێگاکە بە شوێنێکدا دادەچوو، کە گوند و شارێکی زۆری کوردستانی ئێرانت تیا دەدیت، لە سەردەشتەوە بۆ بانە و مەریوان.. بە هەزاران هەزار شوێنی دڵڕفێنت وات دەدیت کە کزەت لە جەرگەوە هەڵدەستا کە ئاخ ئێمە میللەتێکی چەند بەدبەختین ئەو گوندە جوانانە هەمووی لە نالەبارترین وەزعی ژیاندا بوون لەنێو ئەو بەهەشتە خۆشەدا... بەم جۆرە تا گەیشتینەوە کوردستان بە درێژایی چوار کیلۆمەتر بەر لەوەی بگەینە پێنجوین ئێمەیان بەرەڵلا کردو تەسلیمی خاڵەکانی سنووری دڕندەکانی بەعس کراینەوە.

دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بەڕێکەوتین بەرەو پێنجوین، کە وەک لەشکرێکی دیلکراو سەرمان لەبەرخۆ نابوو... لەشکرێک هەموو گیانی برین و گاز و نائومێدی و ئەنجنکراو.. بەهاری بەعس بوو، کە کورد لەو حاڵەتەدایە... لەوێشەوە بردراین بۆ سلێمانی و لەوێش هەمدیس ئازار و ئیهانەیەکی زۆر و هەر لەو شارەدا بە (عائدون الي الصف الوطني) ناوزەد کراین، ئەم ناوەش خاسیەتی تایبەتی خۆی هەبوو ئەویش ئەوەبوو کە یەکسەر لە مرۆڤایەتی دەکەوتی و دەبووی بە هاوڵاتی پلە دە و هەرچی هەقێکی یاسایی و مرۆیی خۆتە لە دەستت دەچوو.. تەنها عەفو دەکرای کڕین و فرۆشتنت بۆ نەبوو دامەزراندن و کارت بۆ نەبوو.. کارئاسانی و کار ڕۆیشتنت بۆ نەبوو مافی سەفەرت نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بۆ هەموو کەسێ ئەوە ساغ دەبۆوە کە شۆڕشی کورد چەند لەسەر هەق بوو، چەند ڕەوا بوو. لە سلێمانییەوە پسوولەیەکیان وەکو عائیدین پێ داین و ئیدی من گەڕامەوە هەولێر... شاری بەدبەختی و پڕ نەهامەتی..

بەڵام لەگەڵ ئەوەش گیانی تۆڵەسەندنەوە و گیانی داگیرساندنەوەی شۆڕش لەدڵی هیچ کەسێکی شەرافەتمەند خامۆش نەبووبۆوە... ڕۆڵەکانی کورد هەمیشە دڵسۆزی خاک و نەتەوەی خۆیان بوون، دوای ئەو هەمووساڵەوە تا گەیشتینە ساڵە بەدبەختەکانی ئەنفال و کیمیاباران من یەکەم شیعری خۆم نووسی بەناوی (سێوی مەرگ) کە گوزارشتی لە کیمیابارانی هەڵەبجە دەکرد و بڵاوم کردەوە.



## لە سەختەندازەکانی ژیانەوە بەرەو شارە گەورەکان

١

ئیدی شۆڕشی کورد لە پشتەوەڕا خەنجەر ڕێژکرا، کە هاتمەوە شار، لەدوای ئەو شکستە گەورەیە شۆڕشی ئەیلوول بە تەواوی لەناو تای سەرسامیدا خەیاڵەکانی ژیانی داهاتووی خۆم سڕکردبوو، لەمەشدا تاکی کورد مومارەسەی عەشقی خۆی دەکات چونکە ئێمە میللەتێکی تەنهاین لەو سەرزەمینەی خودا جگە لەو شۆڕشە هیچی دیکەمان شک نەدەبرد، بۆیە سەرسامی دوای نسکۆهێنان، سەرسامییێکە لە هیچ شتێکی دیکە ناکات،؟ تۆ وا هەست دەکەیت کە پارچەیەک لە جگەرت بەربۆتەوە ناو لەپت، نسکۆێ شۆڕشی ئەیلوول کەسەرێکی قووڵ بوو لەدڵ و دەروونی تاکی کورد، چونکە ڕەشبینی ئایندەی گیانی ئەو تاکەی تەنیبۆوە، ئیدی ئومێدی بەئایندە نەما هێزو گوڕی خەبات کپ بۆوە، شاخەکان ساردبوونەوە، کانییەکان کوێرکران، سەنگەرەکان چۆل کران، دەنگی زولاڵی ئێزگەی شۆڕش بڕا، هەستمان بەوە دەکرد ئیدی ئێمە تەواو بووین، ئایا بەڕاست میللەتان تەواو دەبن؟.

ئەوەبوو گەڕامەوە بۆ خوێندن و چوومەوە کلاسی چوارەمی گشتی و پێنج و شەشی ئەدەبیم لە قوتابخانەی-الاخوە- تەواو کرد، ٧٦٪م وەدەست هێنا لە بەکالۆریادا، پێداویستییەکانی پێشکەشکردنی کۆلێژم جێبەجێ کرد، من خۆم زۆر حەزم لە بەشی ئینگلیزی دەکرد، بەڵام بەداخەوە براکەم کە ئیستمارەکەمی پڕ کردبۆوە بۆمن یەکەم جار (کۆلێژی یاسای) نووسیبوو ئیدی لە ئینگلیزی بێ بەش بووم و لەیاسا وەرگیرام کە بەڕاستی هەتا چوارەم ساڵیشم تەواو کرد هەر ڕقم لەو بەشە دەبۆوەو لەگەڵیا کۆک نەبووم، بەهەرحاڵ بووە قەدەری من، سواری ماشین بووم لەگەڵ چەند برادەرێکی دیکەی قوتابی ڕوومان کردە بەغدای پایتەخت، من قەت بەغدام نەبینیبوو، بۆیەکەمین جاربوو دەچووم بۆ بەغدا یەک پارچە ڕووناکی بوو، دەتگوت چلچرایە، کە ماشێنەکە ڕێگەی ناو بەغدای دەبڕی زۆر نیگەران بووم،

نەمـدەزانـی بۆ، بەڵام دەرکـەوت نیگەرانییـەکـەم دوورکـەوتنەوە بوو لـەو شـارەی کـە هەرگیز جێم نەهێشتبوو، هەستم بەوە دەکرد بەغدا شـارێکی خەوناوی و ئەفسانە ئامێزە، دڵم توند بوو وامدەزانی قەت ناتوانم لەم شارە بژیم. بۆ.؟

٣

بەیانی کـە ڕۆژهەڵات پـەنجـەرەیێکی ژووری هوتێلی- اربیل-ی سـەر شـەقـامی ڕەشیدم کردەوە و تۆزێ سەیری دەرەوەم کرد، بەغدا وەکو شەو وا نەبوو کە من بینی بووم، ئەو شەقامانەی شەو کە وەک چراستان وابوو وانەبوو بەرۆژ زۆر ژەنگاوی و دێرین دیاری دەدا، بۆنی سەردەمەکانی عەباسی لێ دەهات، بەغدا شارێکی زۆر گەورەیەو نموونەی مەدەنیەت و ژیاری زۆری تیایە، کۆشکە سەر لە هەورەکان غەرقی کرێشمەو ڕامانیان دەکردم، پارک و پردی زۆر و شەقامی دوورودرێژ و ئەنتیکاو سینەمای زۆر، شارە هەژارەکەی خۆمی وەبیر دەهێنامەوە، بنکەی ڕۆشنبیری جۆراجۆرو گەلەری و مزگەوت و کلێسا، خوێنێکی دیکەیان لەناو جەستەمدا هەڵدەپڕژاند. ئاوی دیجلەو لێوارە درەختاوییەکانی و ئەبونەواس، کۆڕنیش، بۆنی شیعریان پێ دەبەخشیم، دانشگاکانی و شەقامی کچان و ئەنتیکای کولتووری و چالغی و بەزم و سەفای سەردەمەکانی هارونە ڕەشیدی وەبیر دەهێنامەوە، تەختە شانۆکانی ئەکادیمیاو هۆڵە جۆراجۆرەکانی بانگی مرۆڤیان دەکرد بۆ بوونەوە بەسەر جیهان، بارە جوانەکانی شەقامی سەعدونی بەری دیجلە بەڕاستی پایتەختێکی قەرەباڵغ و پڕ جونبوجۆش و ئاپۆرە بوو، هەرچەند من تارانی پایتەختیشم دوای چەند ساڵێک بینی، بەڵام ئەو ئینتمایەی بەمن نەبەخشی، بازارە جوانەکان و پارکە گەورەکان و پارکی ئاژەڵان، هەمووی بۆمن شتێکی تازە بوون، بەڵام بەغدا بەو هەموو جوانییەوە لە سەر کورسییەکانی حوکمڕانێتیدا ناشیرینترین دڕندەی دەشاردەوە، بۆیە هەرکات سەرم بەرز دەکردەوە کەڵبەی تیژی ئەو دڕندانەم دەهاتەوە بەرچاو کە چۆن چۆنی بەناو جوانی ئەو شارەوە کەڵبەکانیان درێژ دەکەنەوەو جەستەی خاک و نیشتمانی بێ نازی من ونجڕو ونجڕ دەکەن (ئەم نووسینە بەر لە ڕمانی کۆشکی زۆرداری ڕژێم نووسراوە).



٤

گوتم بەغدا بۆمن ئەزموونێکی تازەبوو بۆ ژیان و بەرنامەی ئەدەبیم، یەکەم جار لە گەڕەکی (حەیدەرخانە) گیرسامەوە کە بەسەر شەقامی ڕەشیدەوەیە، گەڕەکێکی زۆر سەیرە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دروستبوونی بەغدای نوێ، خانووەکانی هەمووی خشتی پانی کوورەن، کۆڵانەکانی تەنگ و تریسک بێ مەودان، بەڵام ئەوەی لە حەیدەرخانە تێبینی دەکرێ ئەوەیە دانیشتوانی زۆربەی خانووەکان کرێچی شارەکانی دیکەن هاتوونەتە بەغدا لە قوتابی و مامۆستا و خەڵکی کاسب و ئەوانەی لە بەغدا سەقامگیربوون، من تا ماوەی سێ مانگ هەر لەو حەیدەرخانەیە مامەوە پاشان لە بەشی ناوخۆ وەرگیرام و وەزعم باشتر بوو، بەڕاستی من داراییم زۆر کزولاواز بوو، ناوە ناوە (٥) دیناریان بۆ ڕەوانە دەکردم، من کە لە هەولێر بووم بەرهەمێکی زۆرم لە بەغدا بڵاوکردبۆوە پاداشتەکەیانیم وەرنەگرتبوو، ڕۆژێ برادەرێ پێی وتم (**عبدالغني علي يحيي**) گوتی تۆ پاداشتت هەیە بۆ وەریان ناگری، وەڵڵا ئەوەیان بۆمن یانەسیبێ بوو، لەگەڵ کاک **عبدالغني** چوومە لای صالح حەیدەری کە ئەودەم سەرنووسەری ڕۆژنامەی عێراق بوو، دانیشتم و بەخێراتنی گەرمی لەمن کرد، پێی وتم مێژووی ژمارەکانت هێناوە، گوتم نەوەڵڵا، ئیدی لێی پرسیم کە چەند بابەت بوو گوتم پازدە بیست بابەت بوو، هەر لەسەر باوەڕی خۆیەوە مەبلەغێکی بۆ نووسیم و من زۆر مەمنون بووم و خواحافیزم کرد و چووم بۆ (دەزگای ڕۆشنبیری کوردی) و لەوێش ئەوەندەی هەبوو وەرم گرت، ئیدی مەبلەغەکە زۆر بوو ئەوەیان خەزینەیەک بوو بۆمن، کەیفێکی زۆرم پێ هات بەوەی کە جلێکی جوان و چەند کتێبێ دەکڕم، گەڕامەوە بەشی ناوەخۆو دونیا گەرم بوو گەرماوێکم کرد، شتەکانی گیرفانم لە پەنجەرەکەی حەمام داناو، ئاوێکم بەخۆداکرد و خۆم لەبەر کردو هاتمە دەرەوە بەبێ ئەوەی ئەو شتانەی پەنجەرەو پارەو پولەکەم هەر لەبیربێ، ئیتر سەرکەوتمە قاتی دووەمی بەشی ناوەخۆ، خەوێکم کردو، ئەوسا بەبیرم هاتەوە، ڕامکردە حەمامەکە، بەڵام هایەو هایەو کار لەکار ترازابوو، پارەکەو هەویەکەش کەوتبووە چاڵی گیرفانێکی دیکەوە، هەر نەمدۆزییەوە، بەڕاستی سوێکی زۆرم لەم پارەیە بۆوەو خەمێکی زۆرم بۆ خوارد، چونکە کۆشکی پرۆژەکانم ڕووخاو دەست لە گونان درێژتر مامەوە.

٥

له بەغدا تەواوی قوتابییە کوردەکان، سەرەڕای حیزبێکی زۆر بەشاخەوە، بەڵام هەموویان یەکڕیزو یەکڕا بوون، کوردایەتییێکی خاوێنیان دەکرد، یەکگرتوو بوون و لە خەمی نەتەوەکەی خۆیاندا بوون، ئەوکات کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی هەبوو لە بەغدا کە بۆ ماوەیەک یەکێتی نووسەرانیشی تیابوو لەهەموو کۆڕو کۆبوونەوەکانی ئامادە دەبووم، ئەوساکە ئەدەب و ڕۆشنبیری و شیعرو کتێب تاقە هاوەڵی کوردبوون ئەدیبان تا ڕادەیێکی زۆر باش پێشمەرگەی ناوشارەکان بوون، بەنووسینی شیعرو چیرۆک و وتار خەڵکیان بێدار دەکردەوە بەتایبەت شیعر، دەتوانم بڵێم لەو سەردەمانەی کە قات و قڕی و ئەنفال و کیمیا کوردیان دەهاڕی تاکە شتێک کە مابۆوە ئەدەب و هونەر بوو پارسەنگی ئەو بۆشاییەی شاخەکانی دەکرد، هیچ نەتەوەیێک وەکو کوردی بەسەر نەهاتووە، تەنانەت فڕنەکانی هیتلەریش لەچاو ئەنفال و کیمیای کورد هیچ نەبووە، من هەر لە ساڵانی (٧٦–٧٧دا) بووم بە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد، بەڵام منیان لەسەر بەغدا حساب کرد، ئەودەم د. عزالدین مستەفا ڕەسول سەرۆکی نووسەران بوو، بۆ ماوەیێکی دوورودرێژ من و (مارف عومەر گوڵ) گۆڤاری نووسەری کوردمان هەڵەچنی دەکرد، ئەودەم عەزیز گەردیش لە بەغدا بوو خۆی و کاردۆ گەلاڵی لە یەک ژووردا بوون، کاردۆ گەلاڵی کوڕێکی گەنجی کورد پەروەر بوو، ژێر قەریوڵەکەی هەمیشە پڕی بوو لە بڵاوکراوە حیزبییەکانی کوردستان، ئەودەم تازە سەرەتای سەرهەڵدانی حیزبی سۆسیالیست (کە پێشتر بزووتنەوە بوو) کە ئەویش یەک لە دامەزرێنەرانی بوو، لەهەمان کاتدا شاعیرێکی چاکیش بوو، هەر لە بەغداوەڕا بەشداری دووەم ڤێستڤاڵی شیعریم کرد لە سلێمانی کە بەڕاستی ڤیستڤاڵێکی گەورەبوو، هەر هەموو شیعرەکانی گوزارشتیان لە کورد دەکردو داکۆکی بوو لە کێشە ڕەواکەی، ئەودەم نارنجۆکێکی بەناوودەنگ بوو لە مەیداندا، چوار ساڵی ڕەبەق لە بەغدا خەریکی خوێندن و کاری ئەدەبی و ڕۆشنبیری بووم، هەر لە بەغداش یەکەم دیوانی خۆم بەناوی (خاک و هەڵۆ) لەدەزگای بڵاوکردنەوەی کوردی لە بەغدا بەچاپ گەیاند کە هەنگاوی یەکەمی ئەزموونی شیعریم بوو... پاشان بەکالۆریۆسم لە بەشی یاسا لە کولێژی یاساو ڕامیاری وەرگرت... گەڕامەوە بۆ هەولێر... ئیدی شەڕی نێوان عێراق و ئێران دەستی پێکرد.




## لە بەغداوە بەرەو سەرەتای نەهامەتییەکان

١

– وەک گوتم بەغدا زەخمێکی زۆری بەخشی بە ئەزموونی ئەدەبی من، هەم لە ڕووی بوونەوە بە سەر دونیاو شارەزابوون لە سروتە ئەدەبییەکان و ناسینی ئەدیبانی بەغدا و تێکەڵبوون لەگەڵ سەنتەری زمان و خوونەریتی دیکە، بەغدا شارێکی گەورەبوو، هەموو جۆرە هۆز و نەتەوەو تایەفەیێکی تیابوو، بەهەرحاڵ بەم هەموو پێکهاتە ژیاری و شارستانیەتییە بەغدا یادگارێکی زۆری لە ئێستای مندا دروست کردوە... بەگشتی خەڵکی بەغدا خەڵکانێکی زۆر کراوەو باش بوون لەگەڵ خەڵکی کورد... پێم وایە هیچ دانیشتوانێکی عیراقی ئەوەندەی دانیشتوانی ناو جەرگەی بەغدا مامەڵەیان لەگەڵ کوردان خۆش نەبووە، هەر بۆیەش هەرکەسێ لە بەغدا ژیا بێ جۆرێک لە–حنین–ی هەیە بۆ ئەم شارە خۆشە.

کولێژم تەواو کرد، هەرگیز حەزم لە بەشی یاسا نەبوو، بەڵام سەرەڕای ئەوە هەموو ساڵێک بە کۆنمرەی– باشە– دەرچووم و لەهیچ وانەیەک نەمامەوەو... ڕۆژانی کۆتایی ساڵی ١٩٨٠بۆمن ڕۆژانێکی تەڵخ و ناخۆش بوو، چونکە لەکۆتایی تۆزێ پێشتر براکەم نەخۆش کەوت، عبدالسلام دەشتی دەرچووی پەیمانگای تەکنولۆژیای بەغدا بوو لە مەسەلە تەکنیکییەکان زۆر زیرەک بوو... تادەهات نەخۆشییەکەی بەزەبرتر دەبوو ئەوەبوو لەکاتی ئەزموونی کۆتایی ساڵی چوارەمم برا بۆ موسڵ بۆیە ناچار بووم ئەوماوەیەی کە بۆ خوێندنم هاتبوومەوە لە شاری موسڵ لە نەخۆشخانەدا لای ئەو مامەوە... خوێندنێکی ئەوتۆم نەکرد... کە کاتی ئەزموون هات گەڕامەوە بەغدا... بەڵام لەگەڵ ئەوەش لەتاقیکردنەوەکاندا بەردەوام بووم لەناو ئەزمووندا براکەم کۆچی دوایی کرد و ڕۆژێکیان شەهیدی گەورەی کورد کاک مەهدی خۆشناو هاتە ناو بەشی ناوخۆو بەرلەوە قسەی بکات زانیم هەواڵی مردنی سەلامی برامی پێیە، گوتی با بگەڕێینەوە هەولێر... گیانم تاسا و خەمێکی کوشندە دایگرتم، چونکە خودی سەلام

بوو کە منی ناچارکرد بچم بۆ کولێژی یاسا کە من مەبەستم بوو بچم بۆ بەشی ئینگلیزی، من ئەوەم لەدڵ بوو کە نەیدی من مەبەستی ئەوم بەجێ هێنا، بەکاک مەهدیم گوت دوا ئەزموونم ماوەو بەیانی دەگەڕێمەوە... ئەویش گوتی باشە منیش کارێکم هەیە و بەیانی بەیەکەوە دەگەڕێینەوە. ئەوەبوو بۆ یەکجاری گەڕامەوە هەولێر... بەسەر خەمێکی کوشندەدا... سەلام عاشقی شیعرو ئەدەبیات بوو، بیرمە هەرچی شیعری نایابە لەکوردیدا بەچاپکراوی لە دەفتەرێکەوە ڕێکی دابۆوە... من سوودێکی زۆرم لەو کارە ئەدەبییانەی ئەو کۆی کردبوونەوە وەردەگرت، چونکە هێند ڕێکوپێکی دەپاراستن و بە خەتە خۆشەکەی خۆی دەینووسینەوە پیاو حەزی دەکرد هەمیشە لەبەر باخەڵی بێ... بەڵام زۆر عاشقی شیعری لەتیف هەڵمەت و شێرکۆبێکەس و پەشێو و پەرۆش و هێمن بوو... حەزی لە ڕۆمان بوو، یەکەم ڕۆمانی کە یەکەم جار کە لە بەغدا قوتابی بوو بۆ من هێنایەوە ڕۆمانی (جمیلە) بوو... پاشان کتێبەکەی "یوریس بورسوف بوو... لەگەڵ زۆرانێکی دیکە... بەمردنی سەلام سەرچاوەیێکی گەورەم لەدەست چوو...

من لەو سەردەمەدا زۆر سەرسام بووم بە دەست و نووسینی کەریم سۆفی بەڕاستی ئەدیبێکی وردەکارو بەدیقەتە، ئەویش دەفتەرێکی هەبوو لام وایە ماویەتی کە هەرچی کەتەگوریای جوانی دونیایە لەو دەفتەرەی دەنووسی... سۆفی عاشقێکی گەورەبوو... دەنگخۆشێکی هێجگار عاشق بوو هەموو لاوکەکانی محمد عارف جزیری لەبەر بوو... ئەوکات کە لەبەغدا بووم ئەویش لە بەشی فارسی ئەدەبی دەیخوێند... شیعری جوانی دەنووسی بەڵام بەداخەوە بەردەوام نەبوو... کە گەڕامەوە هەولێر کەوتمە ناو هەشتاکان... ناوچەرگەی گێرمەو کێشە ئاڵۆزەکانی ئەدەبی و سیاسی... داگیرکەران بەڕادەیێک دەستیان نابووە قاقای ئەدیب و نووسەران و خەڵکی کوردستان، ژیان هیچ کلاوڕۆژنەیێکی نەمابوو هەناسەی تێدا بخورێتەوە... نێوەندەکەش بەپێی ئەو وەزعەی تووشی هاتبوو... گروپ و گروپکاری زۆر بوو بوو بەڵام لە ڕاستیدا هەر هەموو گروپەکان لەیەک خەتی نەتەوەیی و خزمەتی نەتەوەی خۆیان دەکرد هەموویان ڕێک بوون لەسەر مەسەلە سەرەکییەکانی کێشەی کورد و هەڵوێست لەدژی داگیرکەر... هەموویان مرۆڤی شۆڕشگێڕ بوون... بەڵام بەداخەوە



من لەگەڵ تەواو کردنی کولێژ کە دامەزرام شەڕی عیراق و ئێرانی بەسەرداهات و من لەئەمانەی گشتی ئابووری و دارایی دامەزرابووم.

بانگ کرام بۆ سەربازی و لە ئۆردی هەولێر بووم و بۆ کەرکوک گوێزرایەنەوە... من هەر لە کەرکوکەوە بامدایەوە گەڕامەوە هەولێر... هیچ چارەیێک نەبوو بۆیە ماڵ و منداڵم پێچایەوەو لە ڕێگەی قەڵادزێوە کە تازە زریڤانی کوڕم دوو هەفتە بوو لەدایک بوو بوو بەرەو ئێران نەجاتگای کوردان بەڕێکەوتم!!.

٢

ڕۆژگارێکی سەخت و ناهەموار بوو، کوردستان لەناو برینی قووڵی خۆیدا دەکوڵا... لەهەموو لایێک ڕۆحی ئینسانی کورد گەمارۆ درابوو، هەر بۆیەش ئومێدی گەورەی من ئەوە بوو دەربازبم، کە کەوتینەڕێ دوو ئەسپمان لە بەستەستێن بەکرێ گرت، بەستەستێن جێگەو پێگەی تەواوی قاچاخچییەکانی میانی سنووری عیراق و ئێران بوو، بەرەبەری ڕۆژاوا بەڕێکەوتین و زریڤانی کوڕم تەمەنی (١٥) ڕۆژێک دەبوو و لە بەتانیێکمان وەرپێچاو لە باوەشی دایکیدا شەتەکمان دا و هەردووکیانم لە پشتی ئەسپ بەستایەوە و خۆشم بەسەر پشتی ئەسپێکەوە بەڕێکەوتین... ڕێگای ناو ئەو شاخانە زۆر ئاڵۆزو تونوتوون بوون... لە شاخی هەزار بە هەزارا سەردوکەوتین و تاریکەشەو بوو... ئەگەر ئەسپ چاوی هێندە بەهێز نەبوا قەت نەیدەتوانی بەسەر ئەو شاخانەدا هەڵگەڕێ، شوێنی واهەبوو ئەگەر نیوسانتم ئەسپ پێی بەهەڵە هاوێشتبا هەموومان هەپروون بەهەپروون دەبووین... بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئەسپ وەک ئەوەی لەناو سامالێکی شیندا بڕوا ئاوا بوو هەرگیز هەڵەی نەدەکرد... هەموو لووتکەکانی دووروبەریش بە ڕەبایەی دوژمن و داگیرکاران پڕ بووبوونەوە، ئێمە دەق لەمیانی ڕەبایەکاندا ڕەت دەبووین... ڕێژنەیەک بەس بوو بۆ لەناوچوونی هەموومان... بەهەر حاڵ لە خۆرائاوابوونەوە تا نیوەشەوێکی زۆر درەنگ گەیشتین بەسنوورە دوورەکانی دەرەوەی دەسەڵاتی ڕژێم و نۆرەی حەسانەوە هات... ئەو شوێنەی کە لێی دابەزین وەک ئەفسانە وابوو... بەهەزاران هەزار مەشخەڵ لەناو ئەم کێوەدا دەیانجریواند، ئەم شوێنە وێستگای هەموو قاچاخچییەکان بوو... هەر لەم وێستگایەدا بەسەدان کاروان یەکتریان دەکرییەوە واتە ئێمە بێ ئەوەی بزانین بەهەمان ئەو کرێیەی کە

دەماندا دەفرۆشراینەوەو دەکڕاینەوە. لەم دەستەوە بۆ ئەو دەست .

دوای دوو سەعاتێک حەسانەوە... دووبارە کەوتینەوە ڕێ، ئەو ڕێیەی من گرتووبوومەبەر دەچۆوە ناو دۆڵی بێداوان و دۆڵەتوێ کە کەوتبووە سەرانی سەردەشتی کوردستانی ئێران ناوچە شاخاوییێکی عاسێیە ئاسمان تەنها بەقەد سەری بیر دیارە... کاتێکی زۆرمان ڕێ بڕی و کە گەیشتینە لێوارەکانی دۆڵەتوێ ڕۆناهی وردە وردە لە گەلییە بەرزەکان بە دیاردەکەوت هەڵبەت هەر لەو کاتەوە بەڕێکەوتین باران بوو تا ئەو ساتەش کە گەیشتینە دۆڵەتوێ... بەهەرحاڵ دوای ئازارێکی زۆر لە دۆڵەتوێ دابەزین...



## لە شاخە هەزار بە هەزارەکانەوە بەرەو هەندەران

کە گەیشتمە دۆڵەتوێ وەزعی سوسیالیست پەرێشان بوو، بە هەزاران کیلۆمەتر لە سەنگەرەکانی پێشەوە دوور بوو، سەرکرادیەتی ئەو حیزبە تژی گفتوگۆی لە یەک جیایی و دژ بەیەکتری بوو...(کە سەیری ئەو شاخە هەزار بەهەزارەم دەکرد بیرم لەوە دەکردەوە کە ئاخۆ چەند سەد ساڵی دیکە دەبێ خەبات بکەین تا ڕزگاری دەبینین، وردە وردە بەفر دەباری و بایێکی سارد گیانی هەڵدەپاچیم، پێشمەرگە لەو ناوچەیەدا لە حاڵەتێکی نەفسی سەیر دەژیان، دۆڵەتوێ لە سەرسنووری ئێراندایە و بە پەڕینەوە لەم دۆڵە بەڕێگەی خدراوە دەگەیت بە میراوە.

وتم کە گەیشتم بایێکی ساردو بارانێکی زۆر بوو، ئەو شەوەی کە گەیشتم یەکەم کەس کە بینیم بۆتان بوو... شەو لە دۆڵەتوێماینەوەو لە ماڵی سەید کاکە کە ئەوسا لەوێ نەبوو و دابەزیبووە سەنگەرەکانی پێشەوە، بۆ بەیانی دوو ئەسپمان گرت و یەکیان بۆ من و ئەویتر بۆ خێزانەکەم ئەوسا تازە زرێڤان هەمووی دوو هەفتەو چەند ڕۆژێ بوو لە دایک بووبوو... ئیدی بەڕێکەوتین... لە وەرزی زستاندا ئەم ناوچانە یەک پارچە بەفر بوون، دۆڵی خدراوێ ترسناکترین شوێن بوو، قاچاغچییەکە هەمیشە ئەوەی دووبارە دەکردەوە کە ئەگەر لەو دۆڵە ڕەت بین ئیدی ترسی بەفر نامینێ و لە هەڕەشەی زریان ڕزگاریمان دەبێت، بەفر چەند لۆرییێکی سووتاوی داپۆشیبوو هێندە باری بوو، تەنها قاچاغچی دەیزانی ڕێ لە کوێیە چۆن کوتەک دەشکێنێ.

لە بەیانییەوە بەڕێکەوتین بەرەبەرەی ڕۆژاوا گەیشتینە سەرسنووری گوندی میراوە، ئەوکات تۆزێ وەستام بەدیار دوکەڵی دوکەڵکێشەکانی ماڵان کەوتمە ڕامانەوە، وای چەند جوان بوو گوند غەرقی بەفر بووبوو... دوکەڵی سپی لە هەموو لایێکەوە دەپڕژایە ئاسمان، گوندی میراوێ خۆی لەناو سروشتێکی بەفراویدا شاردبۆوە، هەر بە تۆزێ وەستان بەرامبەر ئەم گوندە جوانەوە کە بە سەدان کیلۆمەتر لە ڕۆحی شارستانیەتەوە دوور بوو، ڕژیمی شای پێشوو و ڕژێمی ئێستای

ئیسلامی ئێران گەمارۆیان دابوو کەوتمە ناو وەسوەسەییکی شیرین، دیمەنێکی هێجگار دڵڕفێن بوو، میراوە گوندێکی ناودارە لە کوردستانی ئێران ئەودەم حیزبی دیموکراتی ئێران لەوێ بوو، کە گەیشتینە ناو گوند بەپێی ڕاسپاردەی برادەرانی دۆڵەتوێ دەبوایە تاقیبی ناوێک بکەم کە لێپرسراوی سوسیالیست بوو لە دۆڵەتوێ چونکە سوسیالیست کۆک بوو لەگەڵ دیموکرات، بە هەر حاڵ لەرێگەی کەسێکی خەڵکی میراوە توانیمان بچینە ماڵەکەی نەوزاد... شەو داهاتبوو دونیا ساردبوو وەزعی مناڵەکەمان شڕبوو... ڕەوانی بووبوو، کە دابەزین و چاک و چۆنیمان کرد، زانیم خەڵکی هەولێرەو زانی ئێمە هەولێرین خزمەتێکی باشی کردین، شەو لە ماڵی ئەو ماینەوە، هەرچی پێداویستی بوو بۆ ئێمەی دابین کرد، جا لەبەر ئەوەی من گەرەکم بوو بچم بۆ شاری خانێ واتە– پیرانشار– دەبوایە بۆ بنکەکانی حیزبی دیموکرات پسوولەیەک لە بارەگای ئەوانەوە بەمن بدەن، کاک نەوزاد هەمان ئەو پسوولەیەی بۆ هێنام کە تیایا نووسرابوو ڕێگەمان بدەن بپەڕینەوە... بەیانی زوو لەگەڵ کاک نەوزاد هەر بە پێ لەگەڵ ئێمەدا شۆڕبووینەوە بۆ ڕێی دەرەوەی میراوەو لە سەر ڕێگادا چاوەڕوانی ماشینێکمان دەکرد، هەڵبەت تەنها تراکتۆر هەبوو، خواحافیزیمان لە کاک نەوزاد کرد و بەڕێکەوتین، ماوەیێکی باش وەستاین... ئەودەم ماشێنی (د. مەحموود عوسمان) بەلای ئێمە داهات کە ئەویش هەر بۆ پیرانشار دەچوو خۆی و تەنها لێخوڕێک، شەو سەردانی منی کردبوو لە دۆڵەتوێ و منی سەبارەت بە ئەحمەد دەشتی برام دەناسی، بەڵام خوا هەڵناگرێ سڵاوێکی هاکەزایی کرد و بەتەکماندا ڕەت بوو، دەیتوانی ئێمەش هەڵگرێ، بەڵام دیارە بەباشی نەزانیوە... بەهەر حاڵ پاشان تراکتۆرێ هات و بۆی ڕاگرتین و مامەڵەمان کرد و پێکهاتین کە تا پیرانشارمان ببات، سواربووین و بەڕێکەوتین... مرۆڤ تا نەکەوێتە ئەم ڕێگا و بانانە نازانێ کوردستان وڵاتێکی چەند جوان و بەپیت و بەرەکەتە... خۆ ئەگەر ئێمەش خاوەنی دەوڵەتی خۆمان باین ڕەنگە دەبوو بە بەهەشت... شەو گەیشتینە پیرانشار... کە سەبارەت بە ئێران شارێکی سەر سنوورە، دابەزین و یەکسەر لاماندایە ماڵێک و سڵاومان کرد و زانییان تازە هاتووین و بەخێراتنیان کردین نان و چایان بۆ ئامادەکردین.

هەر بەم شەوە ئەگەرچی دەمزانی نێوانی خەڵکی کوردستانی ڕۆژهەڵات و پارتی



دیموکراتی کوردستانی عیراق زۆر ناخۆش بوو، بەڵام بەناچار لێم پرسین کە بارەگای ئەم پارتە لەکوێیە... بە هەرحاڵ وەسفی بۆ کردم و ماڵەوەم جێ هێشت چووم بۆ بارەگای پارتی بەڵام با ئەوەش بڵێم هەر لەبیرم نەمابوو؟ پاشان وەبیرم کەوتەوە خۆ ئەگەر ئەم پسوولەیەم کە لەناو گیرفانم دابوو و لە بنکەکانی پاسداران بدیترابا ئەوە حاڵم لە شوێنێکی دیکە دەبوو... کە گەیشتمە بارەگای پارتی خۆم پێناساندن هەندێکیان منیان ناسی... خەبەریان بۆ لێپرسراوی ئەو ناوە برد کە پرسیم کێیە دەرکەوت ناسیاوێکی خۆم بوو کە ئەودەم بە ملازم محمد ناسرابوو کە دەکاتە کوڕی حاجی عەزیزی خەرابەدراوی، خۆی هات و بەپێکەنینەوە پێشوازییێکی گەرمی لێ کردم و گوتم مناڵیشم لەگەڵدایە... ماشێنێکی نارد و مناڵەکانمیان هێناو منیان لە گوندەکەوە کە لاجانێ بوو بردە پیرانشار و لە ماڵی براکەمدا دابەزیم... ئەوسا هەناسەیێکی دڵنیاییم هەڵکێشاو بۆ شەو هێندە هیلاک بووم هەر زوو کەوتمە خەوێکی قووڵەوە.

# له کێوستانەوە بۆ ناو کتێب

١

ئێران وڵاتێکی خاوەن شارستانیەتێکی دێرین و پڕ لە ڕووداوە، وا بەدیار دەکەوێ هەموو دەسەڵاتێک بەباش و خراپیانەوە بایەخیان بە کتێب داوە، بۆیە هەموو کووچەو کۆلانەکانی شارەکانی پڕن لە کتێبی نایاب نایاب، لەوێ بوو کە زانیم فێربوونی زمانی فارسی بۆمن چەند زرووریە... بۆیە شەو و ڕۆژ خۆم خەریک دەکرد، لەرێگەی تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و قسەکردن لەگەڵ منداڵان و هەوڵدان بۆ خوێندنەوە... لە ماوەییێکی زۆر کورت و پێوانەییدا تاڕادەییێکی باش شارەزای زمانی فارسی بووم... نەک بەو شێوەیەی کە دەمەویست بەڵام دادی دەدام، بۆیە هەر زوو عەریزەیەکم دایە پەروەردەی پیرانشار و داوام کرد کە داممەزرێنن وەک مامۆستا لە زمانی عەرەبی یا ئینگلیزی، هەر زوو وەڵامم درایەوە دیاربوو پێویستییان بەم دوو زمانە هەبوو... بەڵام دایان نەمەزراندم بەڵکو بە- حق التدریس- کە ئەوان بە موحازەرەی لای ئێمەی دەڵێن دامەزرام لە دوو شوێن، یەکەم جار بە مامۆستای ئینگلیزی، من خۆم باش بووم لە ئینگلیزی لە دبیرستانی فاتیمە ئەلزەهرا- کە دەکاتە ئامادەیی لای ئێمەو دووەمیش بە مامۆستای عەرەبی لە قوتابخانەی ناوەندی شەهید موقبلی هەریەکەو چەند موحازەرەیەکم هەبوو... پارەکەی باش نەبوو بەڵام پێی دەژیام...

ئیدی بەرۆژ دەرسم دەگوتەوە دوای ئەمەش هەر خەریکی کتێب بووم، یەکەم ڕۆمانم بە فارسی خوێندەوە – ئینجە مەمەد–ی یەشار کەمال بوو کە هێشتا نەکرابوو بە کوردی... ئەوەی نەمدەزانی بە فەرهەنگ بەرێم دەکرد، بەڕاستی شاکارێکی هێجگار مەزنی یەشار کەماله... ورده ورده لە خوێندنەوەی فارسی ڕاهاتم و لە قوتابخانەش لەگەڵ قوتابیەکان زۆرم قسە دەکرد هەڵە با یانا، ئەوان بۆیان ڕاست دەکردمەوە، بیرم دێ لە – فاطمە الزهرا و–کە ئینگلیزیم دەوتەوە بە پێی توانام بە ئینگلیزی قسەم دەکرد، دیار بوو قوتابیەکان ناڕازی بوون گوتیان دەبێ بە فارسی بۆمان



ڕاڤەکەیت، ئەمە سەرەتا بوو دۆش دامام... وتم باشە بەڵام شتێ هەیە با پێتان بڵێم بە کوردی قسەم کرد وتم من فارسی باش نازانم ئەگەر هەڵە بکەم نابێ پێبکەنن بەڵکو دەبێ یارمەتیم بدەن، وتیان باشە مامۆستا ئێمە هەڵەکانت بۆ ڕاست دەکەینەوە، یەکسەر ناوێکم بانگ کرد و بە فارسی گوتم (بخوان) دەرسەکەت بخوێنە، دیار بوو عەیبی نەبوو یەکسەر دەستی پێکرد، ویستم پێی بڵێم بەرەدوامبە گوتم (مستمر باش) یەکێکیان گوتی (ئاغا نگو مستمر باش بگو ادامە بدە) تائێستاش ئەم دەستەواژەیە لە مێشکمدا دەزرنگێتەوە و ڕوخساری جوان و شیرینی ئەم کچە کوردەم هەر لەبەر چاوەو بۆ تا ئەبەد ناسڕێتەوە، هەلبەت ئەم قوتابخانەیە هی کچان بوو، بەم جۆرە زۆر باش ڕاهاتم لە قسەکردن و خوێندنەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی دەرسی شەشی ئامادەییم دەگوتەوە، منیش وەک قوتابیان دەبوایە شەوانە دەرسی خۆم تەحزیر بکەم و بەرنامەی وتنەوەی وانە ئامادە بکەم بەم جۆرە زۆر زۆر سوودم لە ئینگلیزییەکەش بینی...

٢

من ئەو دەم مامۆستاییێکی ڕووخۆش و هاوڕێی قوتابیان بووم وەکو ئەوانی دیکە نەبووم لە ناوەندی شەهید موقبلی کە عەرەبیم دەگوتەوە لە هەمان کات دەستووری زمانی فارسیشم دەگوتەوە و جارجارە وانەی ئاینیشم دەگوتەوە، لە هیچ شت نەدەپەنگامەوە تەنانەت هەندێ جار لە دەرسی ئاین یەکێکم هەڵدەستاند کە دەنگی زۆر خۆش بوو مامليێی بۆ دەگوتین بە تايبەتی گورانی- دەمەگری مەلول گیان- من لەگەڵ ئەو گۆرانییە یادەوەرییەکانی هەولێرم لێ دەورووژان، خۆشم گۆرانیم بۆ دەگوتن... قوتابیانی کورد لەوێ بەدیار دەکەون کە چەند مەزلووم و بێکەسن... چەند مەحرومن لە زمان و کلتووری خۆیان... تا بەم جۆرە بەدرێژایی چوار ساڵ من هەر خەریکی دەرس گوتنەوە و خوێندنەوەی فارسی بووم... هەر لە کۆتایی ساڵی چوارەم بوو- ئازادی یا مەرگی- کازانتزاکیم کرد بە کوردی پاشان دەستم کرد بە وەرگێڕانی- اوای و حش–ی جاک لەندەن و پاشان کتێبی (ڕەگەکانی ئەلکسی هیلی) کە ئێستا چاپ کراوە، بەڵام داخی گرانم سەختی و غوربەت دڵی هەنجن بە هەنجن کردبووم... هێزی مانەوەی بردبووم... یادی هاوەڵ و ڕەفیقەکانی

ناو شاخم... خوێنیان دەجۆشاندم... بەتایبەتی ژیانەکەش زۆر ناخۆش بوو... گوزەران ئەوکات لە ئێران زۆر زەحمەت بوو... وەزعی سیاسی نێوان دیموکرات و پارتی تا دەهات خوێناویتر دەبوو، تەنانەت قوتابیەکانیش بەچاوی نادۆست تەماشای ئێمەیان دەکرد، نەیاندەزانی ئەوە دوژمن و داگیرکەرانن ئاوەها ئێمە لەیەک دەکەن... هەربۆیەش بڕیارم دا بگەڕێمەوە بۆ کوردستان.



## لە ئێرانەوە بەرەو کوردستان

لە ڕێگەی شنۆوە بەرەو کێلەشین کەوتمەڕێ، کێلەشین ناوچەیەکی شاخاوی بەرز هەڵکەوتووە، ئەگەر لە سەرەتای بەهارانەوە بۆی بچی لە بەرزاییەوە سەیر بکەیت لە هەموو لایەکەوە بریسکەی ئەو ئاوە تەقیوانەی بەرکانییەکان هەڵدەچێتە ئاسمان، ڕەنگاوڕەنگی ئەم ناوچەیە لە وەرزی بەهاراندا کەم نەزیرە، لە ڕاستیدا من ئەوە یەکەمین جارە لە ژیانم شوێنێکی واخۆش ببینم، من شارەزای ئەو ڕێگەیە نەبووم، بەڵام یەکێکم لەگەڵدابوو کە زۆر شارەزاو شەو و ڕۆژ ڕێبرێکی ئازابوو، من لەدوای ئەو ڕێم دەکرد... بەیانی بوو بەڕێکەوتین، ئەو هەمیشە چەند فرسەخێ لەپێش مندا دەڕۆیی منیش بە شوێن پێیەکانی ئەودا دەڕۆیشتم و دێڕە شیعرەکەی کە وابزانم هی (ئودنە ) دەهاتەوە بیر (پیاو بە و شوێن پێم مەکەوە) لەبەرخۆ بزەیەکم دەهاتێ دەمگوت: جا خۆ ئەمە شیعر نییە، ڕۆیشتین ماوەیەکی زۆر درێژ ڕێگەمان بڕی دوای عەسرێکی درەنگ، کەوتینە ناو دارستانێکی چڕ، من هەر خەریکی لێ وردبوونەوە بووم لە جوانییەکانی ئەم ڕێگەو بان و ناوچە شاخاوییەدا.. زۆر ڕامام، کاتێک سەیری بەردەمی خۆمم کرد و تەماشای ئەملاو ئەولام کرد ئاسەواری هاوڕێکەم دیارنییە، شڵەژام، چونکە مرۆڤ ئەگەر لە شاخاندا ڕێ ون بکا ماوەیەکی زۆری دەوێ هەتا دەزانی بۆ کام لا دەچێ، بە ڕاستی هیلاک دەبێ.

وردەوردەش تاریکی باڵی بەسەر شاخاندا دەکێشا.. بیرم کردەوە من تازە ون بووم، وای خودایە، ئەو دەمە دڵم چەند توند بوو، هەموو جوانییەکانم لێ بوون بە دوژمن، هەرچەندە هاوارم دەکرد، بەڵام هەیهو کێ وەڵامم دەداتەوە، قەت دارودرەخت وەڵامی مرۆڤ نادەنەوە... چونکە دەزانن مرۆڤ چەند دڕندەیە وەک شیعرەکەی هۆشی مینە دەڵێ.. بەڕێدا دەڕۆیشتم شێرم بینی خۆی لێ لادام، پڵنگم بینی خۆی لێ لادام، بەڵام کاتێ مرۆڤم بینی هێرشی کردە سەرم و هەلاهەلای کردم، هەڵبەت هاوڕێکەشم بەدواما گەڕاوە، بەڵام ئاخ چۆن بگەینەوە یەکتری لەنێو ئەم هەوارە چڕوپڕەدا..

بەهەرحاڵ من لەگەڵ ئەوەی هەر دەڕۆیشتم و دەڕۆیشتم هەر دەڕۆیشتم، بەڵام هیچم نەمابوو بیر و خەیاڵم بۆ شتێکی دیکە و شوێنێکی دیکە ڕۆیشتبوو، لە ناکاو دەنگێ بەرز بۆوە، ڕاجفریم بەڵام هەمان ئەو دەنگە بوو، منی بردەوە ناو هەمان جوانییەکانی پێشوو گەرم و گوڕی کردمەوە، هەر بەهۆی ئەو دەنگەوە بوو کە هاوڕێکەم دۆزییەوە و دووبارە لەناو تاریکاییدا ڕێگەمان گرتەبەر بەڵام ئەمجارە نەمهێشت مەترێک لێم دوورکەوێتەوە هەتا گەیشتینە سەر لێواری دەشتی هیرتێ، کە دەشتێکی شاخاوی و بێ ئاو بوو، ئەوسا زانیم من گەیشتوومەتەوە کوردستان، هەرچەند من لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بووم بەڵام نازانم بۆ بە گەیشتنم بۆ ئەم ناوە دیدگاشم گۆڕا تەنانەت جوانتریشم بیردەکردەوە، شەوێک لە دەشتی هیرتێ مامەوە باش حەسامەوە مشوری ئەوەم خوارد کە چۆن بگەڕێمەوە ئەوبەری خۆمان، بەڵام قاچاخچی هەند نەقۆڵای هەبوو هەر زوو پێیان دەوتم هەر شوێنێکت بوێ ئێمە دەتوانین وەسیلەی خۆمان هەیە.. بەهەرحاڵ بە سێ قۆناغ گەیشتمەوە سورداش و لە بارەگای یەکێتی نووسەرانی کورد دابەزیم..



## خەونەکانی نووسەران و بارەگای شاخ

کە گەیشتمە بارەگای نووسەران بەڕێگەوە زۆر ماندبوو بووم، چونکە ڕێگەکە زۆر دوورودرێژ و سەختەندازبوو، هەر لەگەڵ گەیشتنم برای چیرۆکنووس حەمە کەریم عارف پێشوازییێکی گەرمی لێ کردم و شوێنێ بۆ دابین کردم، حەمە کەریم هەموو ئێوارەیەک بە سەر کورسی و مێزەوە بوو خەریکی وەرگێڕان بوو... بارەگاکە لە ناوچەیێکی خۆشی شاخاوی سەرەوەی سورداش بوو، بەڕاستی جێگەی تێڕامان و لێوردبوونەوە بوو، ئیش و کارێکی ئەوتۆمان نەبوو، تەنها خوێندنەوەو نووسین، بەڵام شەوانەش دەبوو بە بەزمی کۆڕو گفتوگۆی درێژخایەن سەبارەت بە ئەدەب و ڕۆشنبیری و سیاسەت، بارەگای نووسەران ببوو بە مەرقەدی پیاوچاکان، هەر پێشمەرگەیێ لە کاردەخرا یا تووڕەدەبوو، یا ترسێکی بگەیشتبایێ ڕووی لە بارەگای نووسەران دەکردو دەیانزانی گەر بێنە ئەوێکەوە ئەوە تووشی ئەمان دێن، هەندێ جار ناویان لە بارەگای نووسەران دەنا (کەرتی چا)، برادەرێکمان هەبوو زوو زوو خەوی لێدەکەوت و کتێبەکەشی هەر لە دەستابوو، بەڵام پەنجەی دەخستە ژێر ناو ئەو لاپەڕەیەی کە لە خوێندنەوەدا دەگەیشت پێی، ئێمەش کە کتێبمان لەلا نەبوو، حەزمان دەکرد زوو تەواوبا، جار جارە دەچووین پەنجەکەیمان لادەبردو هەفتا هەشتا لاپەڕەمان ئاودیو دەکرد و پەنجەکەیمان دادەنایە ئەو شوێنە، هەندێ جار وادەبوو ئەو برادەرە دەیگوت باش بوو ڕۆمانەکەم بەیەک جەلسە تەواو کرد، خۆشییەکەی لەوەدابوو کە شەو دادەهات و دەست دەکرا بە گفتوگۆ لە سەر ئەو ڕۆمانە، لە هەمووومان زیاتر قسەی دەکرد و نەیدەزانی کە ئێمە دەزانین نیوەی ڕۆمانەکەی بەدەردی خەوەکەی چووە نەیخوێندۆتەوە.

لەوەش سەیرتر ئەوەیە کە بۆمان ئاشکرا دەکرد باوەڕی نەدەکرد و نەدەگەڕایەوە سەر ئەو لاپەڕانەی کە پەڕاندبوومان. بەبیرم دێ ڕۆمانێکمان لابوو بە ناوی– جسر علی نهر درینا– تەنها بە یەک سەعات کۆتایی پێ هێنا چونکە پاش نیوسەعاتی

یەکەم پەنجەمان خستە لاپەڕەکانی دوایی و کە هەستاوە دەستی پێکرد و تەواوی کرد، ئەم برادەرە جیاوازی لەنێوان پێشی خەوتن و دوای خەوتن نەدەکرد، لە خەودا هەموو شتێکی پێشووی لەبیر دەچۆوە، بەم جۆرە کە نۆرەی ئەو دەهات ئێمە خەنی دەبووین، بۆ ماوەیێکی باش هەر لە بارەگای سورداش ماینەوەو پاشان چوونیە مەرگە و بارەگا دامەزرایەوە، بە هەمان ڕەوتی پێشوو کۆڕی شەوان زۆر گەرم دەبوو... ئێمە زۆر نەبووین، سامی شۆڕش و محمد موکری و سەعدوڵلا پەرۆش و حەمەدەمین بادینی و خەلیل دهۆکی و جەوهەر کرمانج و من بووین.

هەرچەندە وەڕەسی دایدەگرتین، بەڵام چی بکەین قەدەری نەتەوەکەمان هەڵی دابووینە ئەم ناوەوە و دەژیاین... مام حەسەنێک لە شاخەکەی ئەوبەرماڵەکەی دامەزراندبوو، بەڵام سەیر لەوەدابوو... ئەم کابرایە هەمیشە خەریکی هەڵکۆڵینی شاخ بوو جارجارە من و موکری دەمانگوت پێم وایە مام حەسەن دەیەوێ ئەم شاخە لەبن و بۆتکەوە هەڵتەکێنی... ئەن ئاخیری کوڕی ئەو مام حەسەنە تڤەنگەکەی موکری دزی و ئێستاش نەگەڕایەوە.

ناوە ناوەش گۆڤاری نووسەری کوردستانمان ئامادە دەکردوو بڵاومان دەکردووە، ئەوێ دەمێ سەگوەڕی محمد موکری هەراو زەنایێکی زۆری نابۆوە... بەلێشاو لە سەری دەنووسراو نووسرابوو، بەڵام موکری تەقەی سەری دەهات... هەر خەریکی وەرگێڕان بوو...



## کەوەکەی موکری

دەمەدەمی عەسرانێکی درەنگ بوو... لە بنارێکی خەمگیندا من و چەند کەسانێکی وەک خۆم لە بارەگای بن شاخێکی دوور دوور بووین... ئەودەم زستان بوو خەیاڵی ئێمە هەمیشە بۆ ئەوە دەچوو کە ئیدی ئەم زستانە دەچینەوە شارو کەمێ دەحەسێینەوە، ئیدی کوێرەوەری کۆتایی دێت، بەڵام بەداخەوە ئەو زستانە درێژەی کێشا تاوەکو ئێستاش هەر بەردەوامە... ئەوێ دەمێ دڵۆپە کەش و ڕوونەکانی بارانی چیا لە ناوەندی ئاسمان وەستابوون، من و موکری لە حەوشەکەی بارەگای نووسەران خەریکی چاندن و کردنی توور بووین.. موکری کەوی زۆر خۆش دەویست هەروەک منداڵێکی ساوا لە باوەشی دەکرد و ئەم لاوئەولای پێدەکرد.. بۆ ساتێک کەوەکەی دانایە سەر زەوی و تۆزێ بەیەکەوە خەریکی گەڵا توورەکان بووین کە هەندێکیان تازە شین دەبوون.. کە ئاوڕی دایەوە کەوەکە چەند مەترێ هەڵکشابووە بناری شاخەکە.. موکری بەهەندی هەڵنەگرت ئەو پێی وابوو بەدوایا دەچێ ئیدی سووک و سانا دەیگرێتەوە.. بەڵام نا دیاربوو کەوەکە هەر دوور دەکەوتەوە.. بە ناچاری موکری سۆڵێکی لە پێدابوو... بەدوایا داچوو، ئەو دەم باران وردە وردە دەهاتە خوارەوە.. موکری بەدوایا چوو.. ڕۆیی.. ڕۆیی کە ئاوڕم بۆ لایان دایەوە.. تایهو.. تایهو کەو گەیشتبووە دۆلانەکە و ئاوادەبوو موکریش هەر بەدوایدا دەچوو.. باران کردیە ڕاستی ئێوارەی غەرقی تەمێکی مەست دەکرد منیش وامدەزانی موکری شارەزای کەوەکەیە و ئیدی ئێستا نائێستا دێتەوە.. بەڵام نا موکری ون بوو.. هەر بەدوای کەوەکەدا ڕای دەکرد، بەڵام ئاخ نەیدەتوانی بیگرێتەوە.. سەعاتێکی پێچوو موکری هەر نەگەڕایەوە.. دوو سەعاتی پێچوو موکری هەر نەگەڕایەوە، دونیا غەرقی تاریکی بوو.. موکری هەر نەگەڕایەوە.. من خۆم چوومەوە ژوور و خەریکی ئامادەکردنی سفرەی ئێوارە بووم... ئێمە لەو بارەگایەدا کتێبمان زۆر بەعەشقەوە دەخوێندەوەو ئێواران بەسەر سفرەوە گفتوگۆمان لەمەڕ دەکردن.. کۆڕ گەرم دەبوو..

باس دەهاتە سەر هەزاران بابەت خۆمان لەبیر دەکرد.. ئیدی لە چاوەڕوانی موکریدا مامەوە... نەمزانی بۆ نەهاتەوە بەڵام دەمزانی کەوێکی سەرکێش ئەگەر پێی نایە تەلان و بەردو چیا بەزەحمەت بەرزەفت دەکرێ و دەگیرێتەوە.. بۆیە دڵنیا بووم کە دواکەوتنەکەی هەر هی ئەوەیە کە بەدوای کەوەکە ڕادەکا...

ماوەییێکی زۆری پێچوو، شەو تاریک داهاتبوو، باران گەرمی کردبوو ناوەناوە دەزووەبرووسکێ چیاکانی دەبریقاندەوە، بەسەر سفرەوە دانیشتبووم خەریکی کتێبی بودلێر بووم... من زۆر لەمێژە بودلێر دەخوێنمەوە غەرقی شیعرەکانی بوو بووم، بەڵام موکری هەر نەگەڕایەوە، لە هیکەوە گوێم لە دەنگێ بوو، کە چوومە دەرەوە، لە دوورەوە موکریم وەک تارمایی دەهاتە بەرچاو.. هەتا نزیکتر دەبۆوە هیلاکی زیاترم لێ بەدی دەکرد، پۆرترێتەکەی موکری لەودەم ئاوابوو:

پیاوێکی درێژ و قەڵەو دەمانچەیێکی زەبەللاحی بە تەنکێشی شۆڕ بووبۆوە کە تاوەکو ئێستاشی لەگەڵدابێ تەقەیێکی پێ نەکرد، دەستی وەک بازنە لێ کردبوو، کەوێکی دەنووک سووری عاشق بە ئازادی و ڕاکردوو لەدەست موکری ملی دەرکێشابوو، دەنووکی لەبەر باران بریقەی دەدایەوە... زۆرم لا ناخۆش بوو کە کەوەکەی گرتبۆوە چونکە دەزانم کەوەکە لە پێناوی چی ڕایکرد و موکریش لەپێناوی چی بەم چیاو چۆلە کەوتبوو، هەردووکیان لەدەست دیلی، بەڵام ئاخ دیلەکانیش هەندێ جار یەکتر دیل دەکەن... وردەوردە لەبەرخۆ بیردەکاتەوە، ئای ئەوە چ هەواییێکی خۆش بوو.. چ چیاییێکی ڕەنگین.. چ هەناسەیێکی بەتام.. بریا بۆ زەمانێکی دوورودرێژ هەر بەردەوام با..

موکریش لەبەر بارانی ئەو بنار و لووتکانە هەتا سەر ئێسقانی ئاوی هەڵمژتبوو.. ئێستا زۆرجاران ئەو پرسیارە دەکەم کە ئایا مرۆڤ لەتوانایدا هەیە لە پێناوی هەوەسەکانی خۆی تا مووخی باوەڕی بە ئازادی بێ و تێکی نەشکێنی؟! چی دەبوو موکری.. ئاخ موکری لەو کەوە گەڕابای لەنێو ئەم ڕەوەز و شاخانە و لە ژێر تریفەی مانگەشەودا گۆرانییەکانی خۆی بچڕیبا..

ئاخ موکری.. داخ موکری، ئەوە چ یادەوەرییێکە؟

بۆ نەتهێشت پێیە جوان و سوورەکانی ئەم کەوە بەسەر ئەو بەرد و تاوێرانەوە بحەسێتەوە..





ئاخ موکری.. داخ موکری ئەوە بالۆرەی چ عەشقێکە
بۆ نەتهێشت ئەو کەوە لەژێر باراندا
گۆرانی بۆ تەباری ونبووی خۆی بچڕێ
بۆ نەتهێشت گوڵەکەم بۆ نەتهێشت

×××

موکری: مەبەستم ڕۆماننووسی گەورە و بەتوانا محەمەد موکری-یە، کە گەلێ ڕۆمانی بەنرخ و پڕ بەهای نووسیوە و گەلێ شاکاری جیهانی کردووە بە کوردی، موکری یەک لە ستوونە پتەوەکانی شاکاری ئەدەبییە لەنێو کورد.

## بەشی دووەم

# له ئەزموونی ئەدەبدا

# له گەرمەی کێشەکانی دوای نوێبوونەوە

بەر لە ڕاپەڕین مشتومڕێکی زۆر هەبوو سەبارەت بە بزاوتی شیعری تازەی کوردی، ئەو دەمەی ئێمە لە شاخ بووین ئاگاداری باری ئەدەب بووین و زۆر بە وردی سایەدی هەموو گۆڕانکارییەکان بووین، تەواوی گۆڤارە ئەدەبییەکانمان لە ڕێگەی ئەدیب و شاعیرانەوە پێ دەگەیشت، بەڕاستی بابەتی گرینگ و بە پێز بڵاو دەکرانەوە، ئەدیبانی کورد بە تێکڕا لەگەڵ بەرەی شۆڕش بوون، تاک تاکێ نەبووا ئەویش بە پەنجەی دەست دەژمێردران، هەر لەدوای ڕاپەڕین بەیانێکی شیعریم دەربارەی ئەزموونی شیعری خۆم بڵاو کردەوە، لەژێر ناوی (سروتەکانی نووسین) پاش دوای پازدە ساڵ بەیانی دووەمی ئەزموونی شیعری خۆم بڵاو کردەوە کە تیایا باس لە جیهانبینی خۆم دەکەم باس لە نهێنییەکانی شیعر دەکەم،

١

لە بەر ئەوەی من باوکم زانایێکی ئاینی گەورە بووە و هەموو ژیانی خۆی لەنێو کتێبان بردۆتە سەر و شاعیرێکی بەهێزی ڕەوتی کلاسیک بووەو لە بەلاغەتی شیعردا کەم نەزیر بووە، بۆیە هەر لەمناڵییەوە بۆنی کتێبەکانی باوکم کاری لە من کردووەو منی بەرەو دنیای کتێب بردووە، مرۆڤیش کاتێک خەریکی کتێب دەبێ و تۆزێ بەهرەشی تیابێ بەلای شیعردا دەشکێتەوە، هەر ئەوەش بوو کە من بەدرێژایی سی ساڵە هەر خەریکی شیعرم و لەم بوارەدا چەندین دیوانی شیعرم نووسیوە.

٢

پێم وانییە شیعر پێناسەیێکی دیاریکراوی هەبێ، گەورەیی شیعر لە بێ پێناسەیی



خۆیەتی، شیعر بوونەوەرێکی سەیروسەمەرەیە لەناو هیچ چوارچێوەو قاوغێک ناحەوێتەوە، بۆیە من ناتوانم هیچ پێناسەیەک بۆ شیعر هەڵبژێرم، شیعر هەمیشە لەگۆڕاندایە و هیچ یاسایێک هەڵیناسوورێنی، بەتەنها زەین و هزر حوکمی شیعر دەکات و ئەزموون وەدیاری دەخات، مادامەکێ شیعر قووڵبوونەوەی ئەندێشەی مرۆڤە بۆیە تۆ ناتوانی بگەیتە دیماهی ئەم قووڵبوونەوەیە، ڕەنگە شیعری کلاسیک لەبەر ئەوەی هەندێ پێوانەی هەیە دەکرێ پێناسەیێکی فۆرمەکەی بۆ بکرێ... بۆ نموونە دەبێ شیعری کلاسیک کێش و سەرواو قافیەداربێ، بەڵام هەندێ جار وێڕای ئەو پێوانانەش بۆ نموونە شیعری نالی هێشتا هەر ناتوانی پێناسەیێکی دیاریکراوی بۆ بکەین، بەهەرحاڵ با ئەمە کاری ڕەخنەگرەکان بێت.

٣

هیچ شیعرێکی دوای ڕاپەڕینم نەدۆزیوەتەوە لە نەوەی تازە خودانی دیدگاو جیهانبینی خۆی بێ بەو مانایە نا کە شیعری جوان نەبێ بەڵکو بەم مانایەی کە هێزەدی بەردەوامبوونی نەبووە، ڕاستە لەملاو لەملا هەندێ جار ئەو جۆرە شیعرە لە فیلتەری سەختی شیعر دەپەڕێتەوەو شتێکی جوانی لێ دەردەچێ، بەڵام ئەم کەم بەرهەمەی کە من وەک شیعر باسی لێوە دەکەم ناکرێ سیمای قۆناخێک دیاری بکات، شیعر پێویستی بە ئەندێشە و تەئەممول هەیە پێویستی بە هێمنی و لەسەرخۆیی هەیە، هەڵبەتە قۆناغی دوای ڕاپەڕین هەموو گۆڕانەکانی تێدا خێران.. ئەم خێراییە وای کردووە مەودا لەبەردەم گەنجەکان کورت ببێتەوە، بەتایبەت لەدوای ڕاپەڕین وێنە زاڵ بووە، قۆناغی سەدای بەزاندووە.. بەزۆری گەنجەکان سوود لە شاشە وەردەگرن و خەرکی دەبن نەک کتێب، جاران کتێب سەروەر بوو بەڵام ئێستا شاشە. هەڵبەتە جیاوازییەکی زۆریش هەیە لەمیانی کتێب و شاشە لە ڕووی کاریگەرێتییەوە.

٤

شیعری سەرکەوتوو بەخۆی پێمان دەڵێ کە خاوەنی چ تایبەتمەندییێکە، تایبەتمەندییەکانی شیعری سەرکەوتووش وەکو پێناسەی شیعری دیاری ناکرێت،

چونکە فیکر هەیە، مەعریفە هەیە، فەلسەفە هەیە، تەکنیک هەیە لەشیعردا، هەموو ئەمانەش بەدەیان لق و پۆپی دیکەی لێ دەبێتەوە، بۆیە ئەمەشیان هەر کارێکی ئەستەم و دژوارە، ئەوەی بەڕاستی لەشیعر بگات دەزانی بەڕاستی شیعر میحنەتێکی گەورەیە بۆ خودی شاعیر بەڵام ناتوانێ لێی ڕزگار بێت.

٥

نیمایویشج کە بەرەو تازە کردنەوەی شیعر چوو ئازارێکی زۆری چەشت، چونکە کلاسیکی فارسی شیعرگەلێکی هێجگار بەهێزن و ئەوەندە ڕەگ و ڕیشەی لەناو میللەتی فارس چۆتە خوارەوە، کە یەکێک بێت و بیەوێت شتی تازە بڵێ و بەم شێوەیە نەنووسێ، دوژمنداری زۆری دەکرێت، تاڕادەی ئەوەی کە بەکوفری دەزانن... کلاسیکی فارس سیمبۆلی زۆرو گەورەی هەن لە میللەتانی دیکە زیاتر، بۆیە کە نیمایویشج هات تازە بنووسێ بەم واتایە دەبێ کە هەر ئەو بە تەنها پێشەنگە و هەڵگری شوناسی تازەگەرییە، کلاسیکی کوردی وەک هی فارس نییە، ڕاستە هەڵگری شوناسی تایبەتی خۆیەتی و بەڵام ژمارەی بەهێزو پێشەنگی کەمە و لە هەمان کاتدا کورد دەوڵەت نەبووە وەکو فارس خزمەتی کلاسیکی خۆی کردبێ و کاریگەری بۆ نەتەوەکە دروست کردبێ بەڕادەی کتێبی سەرچاوە، واتە کلاسیک بۆ ئەوان سەرچاوەی کەلتورو دەوڵەت بووە بەڵام لەنێو کوردان بە تەنها سەرچاوەی کلتوور بووە، بۆیە هەرکەسێ لەیەک قۆناغدا هەوڵی تازە کردنەوەی شیعری داوەو خەڵکیش ئەوی قبوڵ کردووەو بە کوفریشی نەزانیوە، هەر بۆیەش بەرفراوانترە لەرووی سەرچاوەی تازە کردنەوەو پێشەنگەکانی تازەکردنەوە، مەبەستم ئەوەەی بڵێم لەناو چوارچێوەی ئەدەبی فارسی ڕچەشکێنی تازەگەری ژمارەیان زۆرەو تەنها پێشەنگێک نییە.

٦

چێژ لە شیعری چاک و جوان وەردەگرم کلاسیک بێت یان تازە، ئەوەش دەڵێم من شیعری کلاسیکی کوردی بەشیعری هێجگار چاک دەزانم و ئەزموونی خوێندنەوەیانم هێجگار زۆرە.



شیعری تازەی کوردی لەرۆژی ئەمرۆکەدا سەرەڕای بوونی هەندێ شاعیری باش لە کارەساتدایە، زمان کە بنەمای شیعری تازەیە پووکاوەتەوە، شیعریەت نەماوە، تەنها فرێدانی دەق ماوە، بۆیە ئەوەندە دەقی شیعری بەسەریەکەوە کەڵەکە بووە، خەریکە کتێبخانەی کوردی پڕ دەبێ لە بەرهەمی خراپ، بە تایبەت پرۆسێسی ڕەخنە هێجگار کزو لاوازە، بەڵام لەپاڵ ئەمەشدا شاعیری باشمان هەن بەدڵسۆزی کار لەناو شیعر دەکەن و دەقی جوانیان نووسیوە.

٧

سەر بەهیچ قۆناغ و ڕێبازێک نیم لە ئەدەب و باوەڕیشم بە قۆناغ و ڕێبازان نییە وەک ئەدەب و ڕۆشنبیری، من باوەڕم بەکاری باش هەیە و لەژێر کاریگەرێتی ئەدەب و ڕۆشنبیری باشدا کار دەکەم... ئەو پۆلبەندییانە داهێنراوی ڕەخنەگرە بێ ئاگاکانە، کاری داهێنەران نییە، من نازانم نالی چۆن شیعری نووسیوەو سەر بە چ ڕێباز بووە بەڵام دەزانم شاعیرێکی بەهێزە و کارم لێ دەکات، مەبەستم سەرچاوەی باشە.

٨

هەڵبەتە زمانی بەهێز شیعری بەهێز دروست دەکات، گەمە کردن لەنێو زمان بەو مانایە نایەت بنەمای ئەندازەیی زمان هەڵتەکێنێ، بەڵکو بەو مانایە دێت کە ڕزگاری بکەیت لە دەست (باو) واتە لە مانای ئاسایی خۆی دەربیهێنی.

٩

(جیاوازی) چەمکێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەڵدەگرێ نەک چەمکێکی شیعری، جیاوازی لە فیکردا ڕەگاژۆ دەبێ نەک لەدەقی شیعر، بۆیە زۆربەی شاعیرانمان وەک یەکن چونکە هەڵگری یەک چەمک و یەک شوناسی یەک فیکرن، کە ئەمانە جیاوازبوون شیعریش جیاواز دەبێ، ئەزموونی (جوایەز) ئەزموونێکی جوان بوو کە کۆمەڵێک لە شاعیران ئەزموونیان کرد، بەڵام ئەم هەوڵە هیچ بەرنامەیێکی فیکری و تەقەنی داینەڕشتبوو، تەنها کارێکی دەستەجەمعی بوو بۆ ئەوەی تەکانێک بە بزاوتی شیعری بدرێت بەداخەوە زوو کۆتایی هات.

## ١٠

شیعر لە کاریگەرێتی خۆی ناکەوێ، لەبەر ئەوەی پرۆسێسی شیعر پرۆسێسێکی فەردییەو گوزارشت لە ناخی خودی شاعیر دەکا، هەندێ جاریش لەگەڵ ناخی خوێنەر یەک دەگرێتەوەو پەیوەندی پەیدا دەکات. بۆیە کەمتر دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی گۆڕانەکانی دەوروبەر، من باوەڕم بەم وتەیە نییە کە دەڵێ شیعر باوی نەماوە! کاتێک شیعر باوی نامینێ کە هەستی مرۆڤایەتی باوی نەمینێ، ئەم کاتەش کۆتایی بوونە. هەر کاتێ خۆشەویستی نەما و خورپەی دڵ کۆتایی هات، ڕەنگە ئەوکات شتێ لەم بارەوە هەبێ.

## ١١

من بایەخ بە زمانی خۆم دەدەم و هەوڵ دەدەم پەرەی پێ بدەم، چونکە زمان بڕبڕەی پشتی هەموو ئەدەبیاتێکە، بەبێ بوونی زمانێکی تۆکمە و توندوتۆڵ، ئەدەبیات بە تایبەت شیعر دەمرێ، من زیاتر بەرەو زمانێکی هاوچەرخ دەچم، کە بتوانێ بەرگەی فراوانبوونی ماناکان بگرێت و تەقینەوەی خۆی ئەنجام بدات، دەبێ بایەخ بە زمان بدرێت، ئەمڕۆ لە کوردستان زمانی شیعر خەریکە خودی شیعر بخوات و بەهایەکی ئیستەتیکی بۆ نەهێڵێت، زمان پڕیەتی لە نهێنی ئێمە دەبێ گەوهەری ڕاستەقینەی زمانی نووسین لەناو ئەم نهێنیانەوە دەربهێنین.

نووسینی ڕۆمانێکی گەورە یو شاکار نووسینی شیعرێکی جاویدانی بەزمانێکی تۆکمە، بەشداریکردنە لە بەهێزکردنی جەستەی نەتەوەو کولتوور، مەسەلە جیدییەکان هەر سیاسەت نین، بەڵکو بەهێزکردنی نەتەوەیە لە هەموو ڕوویێکەوە.

## ١٢

پێم باشە بڵێم شیعر لە ئەمڕۆکەدا زیاتر بۆچوونە ناو مانا گرینگەکانە ئەو مانایانەی کە خۆیان لە شوێنە قایمەکان حەشار داوە، ئەو مانایانەی هەموو کەسێ پەییان پێ نابات، واتە شیعر دەبێ شۆڕ بێتەوە ناو ئەو کەلێن و شەقارانەی کە کۆدی مانا بەرزەکانی تێدا ون بووە، ئەمڕۆکە شیعر ئەگەر وێڵی واتا نهێنییەکان و



واتا دامەزرێنەرەکان نەبێت ناتوانێت لەناو دونیای پڕ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیدا هاوشان لەگەڵ داهێنانەکانیدا بژیت، بۆیە شیعر لە ڕۆژی ئەمڕۆکە جیاوازە لەگەڵ شیعری ڕابردوو، شاعیرانی ئەمڕۆکە ڕێگە بە خۆیان نادەن هەموو شتێک کە هاتە بەرقەڵەمیان بینووسنەوە، بەڵکو ئەو شتانە دەنووسنەوە کە هەندێ جار قەڵەم دەشکێنێ، زەمەنی ئەوە بەسەرچوو لەناو ئایدیای شیعردا یاری بە قژ و چاو بکەیت، بەڵکو زەمەنی ئەوە هاتووە تۆ قژێکی جوانتر دروست بکەیت، پەیکەرێ دابتاشی و ڕۆحی وەبەر بێنی، ئەمڕۆکە شیعر دەچێتە ناو هاوکێشە فەلسەفییەکان، بەڵام فەلسەفە نانووسێتەوە، ڕەنگە فەیلەسووفەکان بۆ نووسینی فەلسەفەی خۆیان سوود لەو جۆرە شیعرانە وەرگرن کە من گوزارشتیان لێ دەکەم و لە بارەیانەوە دەدوێم بەڵام شیعر ناتوانێ فەلسەفە بکات بە سەرچاوە بۆ خۆی، چونکە شیعر لە دەرەوەی دیوارەکانی فەلسەفە و حەقیقەتە فەرزکراوەکانیاندا دەوەستێ و مانایەک بۆ ژیان و بوون دروست دەکا، هەموو ژانرەکانی فەلسەفە لە پێناوی ئیقناعکردنی بەرامبەر کار دەکەن، بەڵام شیعر لە پێناوی دروستکردنی واهیمیەک کار دەکات کە مانایەک بدا بە ژیان و مرۆڤ لە هەڵدێرەکانی پرسیاری ترسناک ڕزگار بکات، شیعری ئەمڕۆکە هۆیێکی گرینگە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە ڕاڕەوەکانی بێهوودەیی و نائومێدی لەم سەر زەمینە نەجات بدا و بتوانێ بە سواری پشتی گەلایێ گەورەترین حووتی وەڕسی و بێزاری ڕاو بکات، ئەگەر ڕابردووی شیعری کوردی و هەتا ئێستاش لەبەر پەنجەرەوە سەیری مانگی دەکرد و ڕایدەکێشایە سەر زەوی، ئێستا شیعر لەسەر زەوییەوە ڕەگوڕیشەی مانگێکی جوان دروست دەکات، مانگێ لە هەزاران پارچەی مانا و واتا خۆی شووشتبێ، بە کورتی شیعر دەبێ پارسەنگی مانەوە بێ و جەدوایێک بۆ ڕۆژانەمان دروست بکات و نەهێڵێت بخنکێین.

## ١٣

ئەمە دیاردەی هەموو چاخەکانە کە خوێندنەوە لە بڕگەیێک لە بڕگەکانی مێژوو کز دەبێ، مێژوو هەمیشە هەڵگری خاڵە پۆزیتیفەکان نییە، چونکە تژی هۆکاری جیاجیایە، خوێندنەوە کارێکی ئەستەم و دژوارە بۆ ئەوانەی دەزانن بخوێننەوە، خوێنەر دەبێ خوێندنەوەیێکی قووڵ و بڕشتئامێزی هەبێ و دیقەتدار بێ بۆ سەرجەم

بابەتەکانی داهێنان و کەرەستەکانی گواستنەوەی چەمکەکان بۆ ناو هزر و زەین و تێڕامان، خوێندنەوە پرۆسێسکی مەعریفی گەورەیە دەستووری دژواری خۆی هەیە، من لە شوێنی تر باسم کردووە، خوێندنەوە وەک ئەوەی من باسی دەکەم بریتی نییە لە کردنەوەی کتێب و بەس، بەڵکو بریتییە لە وەرگرتن و گەمەی واتاکان، پەیبردن بە هەزمکردنی چەمکەکان، ئاشکراکردن، بێ ئەو هاوکێشەیە خوێندنەوە دەبێتە ڕەوتی ناو پۆلەکان، لەو ڕووەوە سەیری خوێندنەوەکانی ئەدۆنیس بکە بۆ کولتووری ئەدەبی و شیعری عەرەب لە (الثابت والمتحول)دا هەورەها خوێندنەوە ئیدوارد سەعید بۆ کاری ڕۆژهەڵاتناسی و خوێندنەوەی (صادق جلال العظم) بۆ کولتووری ئاینی و خوێندنەوەی (ت. س. ئەلیوت) بۆ ڕەخنەی میتافیزیکی.

١٤

که دەڵێم شیعر پارسەنگی ژیانە من بۆ ئەوانە قسە دەکەم کە لەو نێوەندەدا ژیان دەبەنەسەر، شاعیر لەپشتی نووسینی شیعرەکانی خۆیەوە هیچ هیوایێکی دیکەی نییە جگە لەوەی کە ببێتە سەلوا بۆ ڕۆحی خۆی، ببێتە وەڵام بۆ ئەو پرسیارانەی کە لە ڕۆحیا سەرهەڵدەدەن شاعیر هەمیشە لە گێژاوێ دەژی کە خودی کتێب و قەڵەم و نووسین بۆی دروست کردووە، خۆ ئەگەر شاعیر خۆی نەچووبایە نێو ئەم جۆرە ژیانەوە ئەویش وەکو ئەوانی دیکە دەژیا، خولیایێکی نەدەبوو بۆ پرسیارکردن هەمیشە قەڵەم و کتێب مرۆڤ دەخەنە داوی گیرۆدەیی بیرکردنەوە، وا لە مرۆڤی شاعیر دەکات هەمیشە بەدوای ئەلتەرناتیڤێکی باشتری ژیانی فیکری بگەڕێ، وای لێدەکات شۆڕ بێتەوە ناو قووڵاییەکانی بیرکردنەوە، بەکورتی کتێب لە ئەنجامیشدا وا لە شاعیر دەکات کە مرۆڤێکی دیکە بێ، گیانێکی جیاواز بێ، بەدیدێکی دیکە جیا لە دەوروبەر سەیری دیاردەکانی ژیانی ڕۆحی بکات. بەم جۆرە شیعر بۆ شاعیر پارسەنگێکی بەهێزی ژیانە..

١٥

ئەگەر بەوردی سەیری ئەو شاعیرە گەورانەی بواری سۆفیگەرێتی بکەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە شیعر چۆن پارسەنگی ژیانی ئەوان بووە.. هەندێ جار بویەری



شیعری ئەوانی ڕاپێچ داوە کە خاک و نیشتمانی خۆیان.. زێدی خۆیان جێ بهێڵن و لەناو دەقی شیعرەکانیاندا خاک و زێد و نیشتمانی خۆیان دروست بکەن، یا هەندێ جار شیعر وای لێ کردوون خاک و نیشتمان و زێدی خۆیان لەنێو شەهادەتدا لەپێناوی دەقێکی شیعری جاویدانی دروست بکەن.

ئەلێرەوەیە من دەڵێم شیعری ڕاستەقینە، شیعرێ کە بەهەڵکفانی خوێن دەنووسرێ چارەنووسی شاعیر دەگۆڕێ لە تەواوی مرۆڤەکانی سەر زەمینی جیا دەکاتەوە و ڕووەو پاکییێکی جاویدانی و عەشقێکی ئەبەدی دەبات تا وای لێ دەکات لە ترۆپکی سۆزو وژدێکا بوونی جەستەیی نامێنێ و دەکەوێتە ناو حاڵەتێکی هولامی و بەرجەستە نابێ.

١٦

لەکاتی خوێندنەوەکانی خۆمدا جیاوازی ناکەم لە بەرهەمەکان، هەموو ئەو بەرهەمانەی کە لەیەکەم دێڕەوە ڕامدەکێشن تا دوا بڕشتی خۆم لەگەڵیان دەبم.. هەندێ بەرهەم بەڕادەیەک سەرسامم دەکەن حەیفە دیقەتی خۆیان پێ نەبەخشم، هەندێ بەرهەمیش هەر لەیەکەم دێڕەوە پێم دەڵێن ئێمە خۆراکی ڕۆحی تۆ نین، بیرم دێ یەکەم جار بۆدلێرم خوێندەوە، زۆری کار لێ نەکردم ئەو کاتەی کە خوێندمەوە هێندە نەچووبوومە ناو دونیای ئەو شاعیرە ناودارانەوە بەڵام دواجار کە گەڕامەوە سەر شیعرەکانی بۆدلێر تێگەیشتم گەورەترین شاعیرێکە کە لەناو ئافەتێکی دەروونی دژواردا کاری کردووە، شاعیرێک بووە ژیانی ڕۆژانەو شیعرەکانی بەڕادەیەک تێکەڵ بەیەک بووین لەیەک ناکرێنەوە، بۆدلێر کە بەشاعیری- نەفرەت لێکراو- ناوزەد کراوە.. گوناهێکە مێژووی ڕەخنە لەکەدار دەکا، شاعیرێک هەموو ژیانی بۆ میهرەبانی و سۆزو خۆشەویستی و بینینی بەرامبەر تەرخان کردبێ و دەقەکانی بەو ئاراستەیەدا بردبێ حەیفە نەفرەتلێکراو بێت، بەڵام زۆر جار مرۆڤ دەبێتە قوربانی بۆچوونەکانی کۆمەڵگە، کەم بووە لە شاعیر گەیشتبن، بۆدلێر دەڵێت- عەبقەرییەت ئەو منداڵێتییەیە کە بەدەستی ئەنقەست زیندووی دەکەینەوە" ئەو هەمیشە هەوڵی دەدا لە شیعرەکانیدا مناڵ بێت و بەرائەتی منداڵی بکاتە پێوانەی ژیان، بەهەمان شێوە من ڕامبۆم لە حاڵەتە سەرکێشییەکانی خۆش دەوێ،

ئەو هەمیشە ڕۆحێکی دانەسوکناوی هەبوو، ڕۆحی سەفەرو جوگرافیای دوور، من زۆر جاران دەڵێم شاعیر بیتوانیایە هەمیشە لە سەفەرە زۆر زۆر دوورەکان بێت، هەمیشە چاوی لەم بێ سنوورییەی دونیا بێت بلیمەتی گەورەی لێ دەردەچێت، ڕامبۆش هەمیشە بەسواری کەشتییە سەرخۆشەکەی عاشقی سەفەری دوور بووە، شیعرەکانی ئاووهەوای حەبەشە و سامالّی فەرەنساو چەقۆی قاچاغچێتی و مەزەی بارەکانی تێدایە، من ئەو ڕۆحە شیعرییە کەمتر دەبینم لە کوردی.

١٧

شاعیران وەک ڕیلکە دەڵێت شووشەیێکی سەرسوڕهێنەرن کە شەرابی ژیانی تێدا دەپارێزرێ، هەر بەم پێودانگەیە شاعیر دەبێ ڕەوانی ئەم شووشەیە بپارێزی و بە ئەمانەتەوە لەناو باخەڵی زەینیدا بیپارێزێ و نەهێڵێت ئەو شەرابەی کە تیایەتی تووشی ئێکسپایەرێتی بێ، بەڵام پاراستنی ناموسی ئەم شووشەیە ژیانی دەوێ، قوربانی دەوێ شاعیر دەبێ قوربانی بە خۆشییەکانی ژیان بدات تا هەندێ لە بەرەکەتی ئەم شەرابەی دەستکەوێ، شاعیر هەتا بە ئەزموون دادەچێ ئەوەندە شیعر لەلای ئەو گەورەتر دەبێ، هێندەش ئاڵۆزو نادیارتر دەبێ، ئەزموونی بەردەوام فێرمان دەکات کە شیعر کارێکی ئاسان نییە، چونکە شاعیر خۆی دەنووسێتەوە، بۆیە حەرامە کەسێ بەبێ ئەزموون خۆی بنووسێتەوە، چونکە بە تەئکید ئەگەر ئەو کارە بکات تەشویهی خۆی دەکات. هەربۆیەش بۆ ئەوەی کارێکی باش و زەینکی باش لەناو دەقی شیعر بە خەرج بدەین جوانتر خۆمان پێشکەش بەجیهان دەکەین ئەگینا ڕوخسارێکی شێواوی خۆمان لەم سەر زەمینەدا بەجێ دەهێڵین.

١٨

لە ڕاستیدا هەتا لەو سەردەمانەش کە ژێردەستی و کۆیلایەتی هەبوو شیعر بەرگری لەوە کردووە کە نابێ مرۆڤ ژێردەستە و کۆیلە بێ، بەڵام ئەگەر بە وردی بچینە بنج و بنەوانی ئەو شیعرانەی کە بۆ ئەم مەبەستە نووسراون، سەیر دەکەی لە جیهان و تەڕێتی شیعردا چوونەتە دەرەوە و بوونەتە نەزمێک و ڕۆحی شیعریان لەناودا کاڵ بۆتەوە، دەخوازم بڵێم شیعر زیاتر گەمەیەکی ئیستەتیکییە و شاعیر



لەناو دەقدا یاری بە زمان و مانا و ڕستە دەکات بۆ ئەوەی دەقێکی سیحراوی پێشکەش بکات، تا ئەوەی بەرامبەر بە خودی خۆی سەرسام بکات، ناکرێ بڵێین ئەرکی شیعر ڕزگارکردنی کۆمەڵگەیە، چونکە لە بنەڕەتدا شیعر ژانرێکی بێ ئەرکە، ڕەهایە، دژی فەزای سنووردارە، مومارەسەی جۆرێک لە پەرستنە لە ویژدان و ڕۆح و نابینراودا دیقەت دروست دەکات، بۆیە کە بوو بە مەیدانی سیاسەت، هاوکێشەکە تێکدەچێ...شیعر میحرابی پاکییە و سروتی ئاشکراکردنی نهێنییەکانی زەینی شاعیرە و ناکرێ کۆت و پێوەندی بۆ ساز بکەین.

١٩

گەورەترین و پرسەدارترین و پڕ ئاوازترین و کاریگەرترین چەمکی شیعر سەدای گریانی ڕۆحە، ئەو ڕۆحەی تا ئێستا مرۆڤ نازانێ لە پای چییە و لە سۆنگەی چییە هەمیشە لەگریاندایە، ئایا گریان ڕاستەقینەی ڕۆحی مرۆڤە؟! ئایا لە ئەزەلەوە کە مرۆڤ بە زریکەوە لەدایک دەبێ، ئەو زریکەیە تۆتە سروشتی ڕۆحی مرۆڤ کە هەمیشە لەپەنا ئەو پەسووە خەمگینەدا سەدایەک بەرز دەبێتەوە بانگمان دەکات بەڵام هەرگیز نە بەشوێنی ئەو سەدایە دەزانین نە پەی بە وشە و پیتی ئەو سەدایە دەبەین، بۆیە شاعیران ناچار پەنا بۆ ئەو شیعرە دەبەن کە تەنها ئەو دەزانێ هەمان ئەو گریانە لە کوێوەە دێت، نهێنێ ئەم گریانە چییە؟ دەق هەمان پرسیاری گۆرانی گەورە دەکات (چییە ئەی ڕۆحی بێ لێوارو بێ پەی لە تۆ ناشارەزایی من هەتا کەی؟) بەڵێ شیعر پرسیاری خوڵقاوی ئەم سەدایەیە گریانی ڕۆحی هەڵکرووزاوی مرۆڤ، شیعر دەنگدانەوەی ئەم گریانەیە کە سەلوایەکمان پێ دەبەخشێ.

## بەشی سێیەم

# بەیانی یەکەمی ئەزموونی شیعریم
# سرووتەکانی نووسین

١

نووسین بۆ من ڕەزمی مانەوەیە، ڕەزمی ناوەوەی ژیانە بۆیەش هەمیشە لە هەر شوێنێک بم بیر لە نووسین دەکەمەوە، چونکە دەزانم بێ نووسین ڕۆدەچم و دەتوێمەوە، بێ نووسین هەست بە هیچ ئاسەوارێکی خۆم ناکەم، تەنانەت ئەو کاتانەی کە نانووسم هەست بە بوونی تەواوی خۆم ناکەم، ڕەنگە هەبن ئەوە بە حەقیقەتێک نەزانن، بەڵام ئەوان خۆیان وان و هێشتاکە شارەزای ئەم لۆگۆسە نەبووینە، کاری نووسین پەڕینەوەیە بۆ جیهانێک جگە لە خودی نووسەری ڕاستەقینە کەسی دیکەی تێدا نییە، جیهانێک زێتر لە شەوق و سیحر دەچێ، لە فەریکی ئەو گوڵەگەنمە دەچێ کە شیری ژیانی تێدا دەجمێ و دەکەوێتە سەماوە، بۆیە نووسین لە دید و بۆچوونی من ئەنجامدانی فەرزەکانی ئاینێکە لە هی ئاینێکی دیکە ناچێ، کە ئەمە درامای نووسین بێ دەبێ نووسەر بە چ درووودێکەوە بچێتە نێو ئەو پەرستگا پیرۆزەوە، چۆن لەبەردەم ئاگری نێویەوە بنوشتێتەوە ؟ ئەمەیان نهێنییەکە تەنیا ئەو کەسانە پەی پێ دەبەن کە لە ناوەوەی پەرستگەکانی خۆیان سرووتی داهێنان بەڕێوەدەبەن .

٢

کاتێک قەڵەم دەگرمە دەست و دەچمە ئاوایی شیعر تەکانێکی بەهێز دەدەمە بەر خۆم و خوێنێکی هێجگار زۆری جەستەم دەخەمە خرۆش، بۆ ئەوەی بتوانم بەرگەی ئەو هەموو پۆلیە ئاگرانە بگرم کە لە نادیارەوە دەبارێتە سەر ڕۆحم.

زۆر جار لە خۆم دەپرسم و بەنێو کتێبەکانەوە دەگەڕێم، دەچمە قووڵایی هەموو



کێشەکان، هەر بۆ ئەوەی بزانم ئاخۆ ئەم هەموو ئاگرە لە کوێوە دێ و هێندە بە لەززەت هەڵدەپڕژێتە سەر ئەتڵەسی نووسەرەوە، بەڵام هەموو هەوڵەکان بێهوودەن، مەحاڵە دەرک بەو سەرچاوانە بکەین کە ئاگری نووسین بەرپا دەکەن، چونکە دڵنیام بە دۆزینەوەی ئەم سەرچاوانە هەرچی بەها و ئیستەتیکای نووسین هەن وردو خاش دەبن و هیچ بەهایێک بۆ نووسین نامێنێتەوە، ئەلێرەوەیە پرۆسێسی نووسین بۆمن چۆنیەتی پێشوازی کردن لەم ئاگرانە، یاخود پرۆسێسی دووبارە خەڵق کردنەوەی پرۆمیتۆس و کاری ئاگردزینە لە خوداوەندەکان، کە ئەمەشیان قوربانیدان و چوونەژێر باری قەدەرە .

٣

ئەو کاتەی قەڵەمم گرتە دەست و خۆم ئامادەکرد ئەوە هێشتا نەچوومەتە نێو ئەو میحرابە موقەددەسەی کە نووسەر تیایا هەموو جوانییەکانی ڕۆحی خۆی بۆ دەقێکی جاویدانی لەدەست دەدا لە پێناوی ئەم جوانییانەی کە لەنێو دەرگا و پەنجەرە و کەوانەی ئەم میحرابەدا خۆیان حەشار داوە و هاواری قەڵەمی نووسەر دەکەن رزگاریان کات لەو نادیاری و نهێنییانەوە، هەر بۆیەش لەگەڵ یەکەم ساتی تێکەڵبوونم بەو زەمەنە نادیار و ئەو جوانییە نادیارانە و ئەو فەزایە بخوورییە، هەموو وجودی خۆم ون دەکەم و بەناچاری دەبێ خۆم لە نووسینی شیعر خەڵق کەمەوە، کەواتە نووسین هەمدیس بۆ من ئەنجامدانی سرووتەکانی قەقنەسە لە سووتان و دووبارە زیندوو بوونەوەی لەخۆڵەمێشەکەی خۆیدا، کتومت نووسینی شیعر سرووتێکی ئەفسانەیی سیحر ئامێزە، ئەلێرەوەیە کێشە سەختەکەی شیعر دێتە ئاراوە، ئیدی ئەو لافاوە دەست پێ دەکاو هەڵدەچێ کە ئامان و بوار بە هەموو نووسەرێ نادات، نووسەر دەکەوێتە ژێر سرووتی شمشێرەکەی دیموکلیس هاکا بە جوانییەکان کۆتایی پێدێت.

٤

ئەلێرەوە و لە هەمان ئەو فەزایە تراژیدی و لەززەتبارەوە من قەڵەم بە کاغەزدا دەهێنم و بێباکانە، یەکەیەکەی دەمارەکان و تەڵە تەڵە ئیحساساتەکانی خۆم

پێشکەش بە جەللادەکانی جوانی دەکەم، ئەو جەللادە شەرمنانەی کە بە ئاستەم دیارن و دیارنین، بەم جۆرە شیعر نووسین لەلای من لەدەستدانی بە ئەنقەستی هەموو ڕۆح و بۆن و بەرامەی خودە، ئەو خودەی کە بەم کارەوە خاڵی دەبێت لە هەموو ئەو شتانەی کە بەر لەهاتنە نێو ئەو مەعبەدە پڕی بوو لە جووڵەو خرۆش، پڕی بوو لەو هۆکارانەی ژیانیان بەهیواوە لەئامێز گرتبوو، ئەو مەعبەدەی لەدوورەوە فێردەوسێکی هێجگار غەریب و جێ مەبەست بوو، یاخود یۆتۆپیایەک بوو بۆ (من)ی شیعر، بەلام کە دەچێتە ناویەوە بەڕاستی گۆڕستانێکی گەورەی جەستەی (من)ی شاعیرە، بەمجۆرە بەدرێژایی ساڵانی نووسینی شیعر هەمیشە چوونم بۆ نووسین، چوون بووە بۆ نێو ئەو یۆتۆپیایە و هاتنەوەشم هەمیشە گەڕانەوە بووە لەو گۆڕستانە، لەمیانی یۆتۆپیا و گۆڕاستاندا من ئەزموونی نووسینی شیعری خۆم پەرە پێداوە و هەمیشە سیزیف لەناخمدا دەستی بەڕەگی بەردەوامیم گرتووە.

٥

ستوونەکانی ئەو مەعبەدە و هەڵوەرین بەنێو هەیوانەکانی؟

مەعبەدی شیعر نووسینی من، لە هی هیچ کەسێ ناچێ، تەنانەت دەتوانم ئەوە بڵێم و دەشتوانن لە شیعرەکانمدا ئەوە بدۆزنەوە کە من شاعیرێکم خودانی مەعبەدێکی وام نموونەی قبووڵ نییە، نە لەدەر و دیوارەکانی دەرەوەی، نە لە شێوە و سیمای کۆشک و تەلاری، نە لە تاق و پەنجەرەکانییەوە، مەعبەدی شیعر نووسینی من نە کەس دیویەتی و نەکەسیش دەیبینێ، پێتان سەیر نەبێ کە من بۆ خۆم مەعبەدی وام هەڵبژاردووە، لە شووشەی شکاوی مرۆڤایەتی دروستم کردووە و بەکریستاڵی دارژاوی فرمێسکی مرۆڤایەتی ئاوم داوەو بەپارچە پارچە بوونی جەستەی خۆم ئاڵ و والام کردووە، بۆیە ئەوەی قبوڵیەتی خودی خۆی یا خودی شاعیر خۆی بکاتە قوربانی، دەتوانێ مەعبەدێک ئاوەها بۆ خۆی بونیات بنێ و لە نووسینی شیعردا تێیدا فەنابێت و حەللاج ئاسا لەکاتی ڕشتنی خوێنیدا بۆ ئەوەی خەڵک پێی نەڵێن ترساوە و ڕەنگی زەرد بووە، بە دەستەکانی خۆی خوێنی جەستەی خۆی لە ڕوخساری هەڵسویوە.. ئاوەها دەبێ بە خوێنی خۆی ڕوخساری خۆی سوور بکات. ئەمە مەعبەدی نووسینی منە..



٦

کاتێک لە پرۆسەی نووسینی شیعردا لەژێر ستوونەکانی ئەو مەعبەدە دەوەستم خۆم تاقە کەسێکم سەلیبی خۆم لە دەستەو بیر لە پاڵەوانەکانی مێژوو دەکەمەوە (نیتشە) کە بە کوشتنی خواکان کۆتایی مێژووی ڕاگەیاند، مەسیح کە بە چوونە ژێرباری سەلیبەوە ترۆپکی هەموو قوربانییەکانی دارشت، کەواتە داهێنانیش بوارێکی دیکەیە بۆ دروستبوونی پاڵەوان، ئەوەی شیعریش دەنووسێ دەبێ سڵ لە چارەنووسێکی ئاوا نەکاتەوە، هەربۆیەش جاروبار سەر بەرز دەکەمەوەو لە بەرزی ئەو ستوونانە دەگەڕێم کە نایانبینم... ڕەنگە سەریان لە حەوت تەبەقەی ئاسماندا بێ، ڕەنگیشە سەریان هەر لەلای خواوەندا بێ، کەواتە من لەژێر سێبەرێکدا مەعبەدم تەی کردووە، کە لە هێزو قودرەتی مرۆڤ نەبێ بەبالایدا هەڵگەڕێ، بەلام دەبێ پێیدا هەڵگەڕێ جا یا سەردەکەوێ یاخود دەبێ بکەوێتە بنەوە، من لەژێر ئەو ستوونانەوە بەدوای ڕۆحی بەردەوامبوونی شیعرێک دەگەڕێم جاویدان بێت.

٧

کاتێکیش دەچمە بەر ئەو پەنجەرانەی کە لەنێو ئەو مەعبەدەدایە، هەموو ڕووداوەکان دەبینم، تراژیدیاکانی ئەم سەرزەمینە، ئاگری سووتانی ڕۆما و پرووشکی فرنەکانی هیتلەر و کارەساتەکانی تزار و تەقینەوەی بۆمبی ئەتۆمی.. گەلێ گەلێ لەو تراژیدیایانە دەبینم کە هەرگیز کۆتاییان نایەت، بۆیە هەندێ جار لە بەرامبەر ئەوانەوە هەر لەبەر ئەم پەنجەرانەوە، قەڵەمم وشک دەکات و ناتوانێ بگاتە ئاستێک لە داهێنان، باسکردن تێیدا گەورەتر بێ لە حەقیقەتی ئەو ڕووداوانە... هەندێ جاریش هەر لەبەر ئەو پەنجەرانەوە فریشتەکانی جوانی و ئۆپێرا و سەماکان و فڕینی مەلە جوانەکان و مەلەی کچانی بەهەشت، دیالۆژی عاشقەکان دەبینم و ئیدی قەڵەم دەبێتە ئەو ئاسمانەی کە لە باران ناکەوێ، لەبەر ئەو پەنجەرانەوە هەندێ جار شیعرەکانم ئاوی جاویدانی مەلحەمییەت دەخۆنەوە و هەندێ جاریش زەربەی تۆماری خێرا لێدەدەن، ژیانی نووسین لە بەرابەر ئەو پەنجەرانەوە بە ڕاستی و سەخت و نهێنی ئامێزە بۆ شاعیر .

## ٨

لەنێو ئەو مەعبەدە پیرۆزەی مندا ژیانی نووسین بریتییە لە هەڵگرتنەوەی ئەو ڕۆحەی کە بەدوای وەدەسهێنانی جوانیدا وەک گەوهەری عومر هەڵدەڕژێ، ژیانی نووسین بریتییە لە گەڕان بەدوای ئەو پارچە شکاوانەی لە جەستەی نووسەردا دەبێتەوە لەو کاتانەی لەژێر ستوون و پەنجەرەکانیدا سەیری ئاوابوونی خۆر و هەڵوەرینی گەڵا و دروستکردنی هێلانە دەکات، بەم جۆرەی هەموو شتێ لەو مەعبەدەدا قوربانی دەوێ، هەموو جوانییەک بەشێک لە دارمانی جەستەی دەوێ و هەموو داهێنانێک هۆیەکە بۆ خاڵیبوون لەو ئەزموونانەی کە بۆ ساتێکی نووسین کۆیان دەکەیتەوە، ئەم مەعبەدەی من ڕێگە بە هەموو کەسێکی داهێنەر دەدات، بەڵام هەرگیز زامنی داهێنانیان بۆ ناکات.

## ٩

من هەر لەهەوەڵەوە تەک تەک خشتم لە مەزارە دوورەکانی ڕۆحەوە بۆ ئەو مەعبەدە هێناوە، ئاوی جاویدانیم بۆ لە جۆگەلە نادیارەکانی بەهەشتەوە ڕاکێشاوە و قورقوشمی جوانیشم لە سەرچاوەکانی ئاگری دۆزەخەوە بۆ هێناوە، تەنانەت بەنووسینی چەندین و چەندین شیعر نەمتوانی سیمای دەرگایەکی بچووک بۆ ئەو مەعبەدە لەبەر چاوم بەرجەستە بکەم، بەڵکو عومرێکی درێژم بردە سەر تا لەچەند قەسیدەیەکا تروسکەی ئەو مەعبەدەم وەک نوورێکی خودایی بۆ بەدیارکەوت، شەوانە لەبەر ڕۆناهی ئەو تروسکانەوە دەچوومەوە ئاگردانەکەی زەردەشت وردە وردە ئەو مەعبەدەم بۆ مشتومالّ دەبوو... گەلێ سات و وەختان مەستانە دەچوومە بەر ئەو قاپیەی لەژێر تروسکایی ئەو مەعبەدەدا بەدیاردەکەوت، سەیری ناوەوەی ئەو دنیایەم دەکرد، هەر هەمووی سیحر و خورافات بوو، ئەفسانە بوو، گێرمەو کێشەی خواکان بوو، ونبوونی ئۆلیس و گومانی هاملێت بوو، دنیایەک بوو تا ئەو ساتەشی لەگەڵدابێ، من لە سیحری ئەو مەعبەدە نەگەیشتووم، هەر ڕۆژە و نهێنییەکم بۆ ئاشکرا دەبێ و هەرساتە لەبەرابەر چڵە نەرگزێکی شیعرەکانم ئاوی ژیان دەخۆنەوە.





## ١٠

ڕۆژە باراناوییەکانی نێو مەعبەد ئەو ساتانەن لە نووسینی شیعردا لەژێر کڵاوڕۆژنەی گومەزی ئەو مەعبەدە سەیری دەرەوەی ئەو مەعبەدە دەکەم، چونکە مەعبەدەکەی من کاستالیای هێرمان هیسە و ژوورە گۆشە گیراوەکەی پرۆستە، تەنانەت هەندێ جار گوێم لە قوتابییەکانی مەعبەد دەبێ کە چۆن چۆنی دوعا بۆ ئەو سەفەرەم دەکەن، سەفەرێک کە لە میعراجی دانتی دەچێ، دەرەوەی ئەو مەعبەدە بۆ من جەنجاڵێکە لە شیعر، هەن دەنگیان زۆر بەرزە و بەقایم قسە دەکەن، بەڵام هەرگیز لێیان حاڵی نابن، لێرە بۆنی ئەو شیعرانەی دەرەوە لە ویزەی کۆمەڵە هەنگێک دەچێ بەناو یەکا دەسووڕێنەوە، هەندێکی دیکە دەبیستم کە نایانەوێ بچنە نێو ئەو گەڕەلاوژیەو نەرم نەرم کەوتوونەتە سەر جەستەی شیعرەکانی خۆیان و بەهێمنی گەوهەرەکانی شیعر بەسەریەکەوە دادەڕێژن، ئەوانە بانگ دەکەمە مەعبەدەکەی خۆم و زۆران جار بەیەکەوە لە نووسینی شیعر و وەدەستهێنانی داهێنان سەفەر دەکەین.

## ١١

(نالی و مەحوی) فەرجیلی (دانتی)ین بۆ هەمیشە و بێ وچان ڕابەرایەتیم دەکەن لەو میعراجە سەختەی نێو مەعبەدەکەی خۆم وەک دوو ئیمامی گەورە و نوورانی نهێنییەکانی نێو مەعبەدم بۆ بەرەلا دەکەن، ئەمە چەند نهێنییەکی زۆر بچووکی چۆنیەتی نووسینی منە لە شیعر و تەنیا چەند ساتێکی ئاشکرای نێو ئەو مەعبەدە پیرۆزەیە.

# بەیانی دووەمی ئەزموونی شیعریم

## سەرەتا و ئێستای خەمگینی تازەبوونەوە

١

تازەبوونەوە ڕۆحێکی دیکەنییە وەبەر جەستەی مرۆڤێک یا درەختێک یا هەر نیهادێکی دیکەدا بێت بەڵکو لەرزینێکی پڕ لە جۆش و خرۆشی بیرکردنەوەو داڕمانی بونیادەکانی ئەو نیهادانەیە و کە بۆ یاساو ڕێسای زەمەنێک کاریان کردووەو ئێستاکێ بڕستی ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ بویەرو مەرجەکانی هاوچەرخ نەماوە و دەبێ بە دوای بابەتیگەلێک بگەڕێن کە مەودای دووبارە ژیانەوەیان پێ ببەخشێ، یاخود بەمانایێکی دیکە تازەبوونەوە هاوکاتە لەگەڵ لەکارکەوتنی دیدگاو جیهانبینییەک کە توانای ژیانیان نەماوە لە ناو پرۆسێسی بیرکردنەوەی تازەدا، ئەوە لەکاتێکدا کاری بۆدەکرێ ئەگەر بمانەوێ لەگەڵ دەرهاوێشتەکانی پەرەسەندنی تەکنەلۆژی و هێرشی بەربلاوی گڵوباڵیزەیشن بژین، یاخود لانی کەم بمانەوێ بەرگەی کاریگەرییەکانی بگرین، بە ئۆپۆزیتی ئەم ئاراستەیە ناتوانین چرکەیەک لە نێو شاشەی تازەگەرێتیدا نمایشی دەق بکەین، کە مەبەستی ئێمەلەم تازەنۆشییە جەستەی دەقە یا بەگشتی تێکستە ئەدەبییەکانە .

٢

هەفتاکان کانگەی بەلاو کانگەی سەرهەڵدانی فەوزایێکی ئێستەتیکی ئەو بەلایە بوو، بۆیە دەڵیم بەلا چونکە ئەودەم هەمان ئەو بەلایە خەرەندێک بوو دەبوایە ئەدەبی کوردی بەخۆ هەڵدانە ناویەوە پرۆسێسی خۆکوژی نمایش بکات، کەیسی سیاسی لەلایەک کە لەناو چارەنووسێکی نادیاردا هەنگاوی دەهاوێشت و هێشتاکەش لەناو منداڵێتی خۆیدا دەژیا و هێزی بڕیاردان و دابڕانی نەبوو، لەلایێکی دیکەدا کۆمەڵگەی کوردی لەنێو ئەوپەڕی دواکەوتوویی دەژیاو لەهەموو ڕوویێکەوە



نەشارەزایی و دوورە پەرێزی لەژێدەرە بەرهەمهێنەرەکانی مەعریفی و فیکری پەنگاوەی دابۆوە، بەتایبەت ڕەوتێکی زمانەوانی وا هەڵیدەسووڕاند کە هیچ پەیوەندییێکی نەبەزمانی داڕشتنەوە هەبوو نە بە زمانی دیالۆگەوە، بەم جۆرە گوتاری سیاسی و گوتاری سۆسیۆلۆژی و گوتاری زمان سێ بەربەست و سێ زیڕۆی بێ بونیادی هەوڵەکانی تازەگەریی بوون، بۆیە نەیانتوانی بەدرێژایی ئەزموونی دە ساڵ ببن بە پڕۆژەییێکی زیندوو کە داهاتوو ئێستای لەسەر بونیاد بنێین .

٣

ئەوەی ئاشکرا و بەڵگە نەویستە ئەوەیە تێکستی پەیوەست بە داهێنانی تاک کە بەری ڕەنجی بیرکردنەوە و داهێنانی تاکەکەسییە بەتەنها ناتوانێ پرۆسەی دروستکردنی کەلتوور بەڕێوە ببات ئەگەر هاتووکاری تیوربەندی وتیوریزەکردنی لەگەڵدا نەبێت، ئەوە بیروڕایەکی کوشندەیە کە تێکەز لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئێمە پێویستیمان بە پرۆسێسی تیوریزەکردن نییە، هەر ئەوەشە وای کردووە کە زۆربەی داهێنەرەکان لە هەموو بوارەکانی تێکستدا دوورە پەرێز بوەستن، لەمەڕ مەسەلەکانی خستنەڕووی بیروبۆچوونەکانییان، بۆیە گۆشەی ئەم جۆرە نووسینانە لە نێو پانتایی ئەدەبی کوردیدا خاڵییە و ڕەنگە ڕۆژانێک دابێت نەوەکانی داهاتوو پرسیاری ئەوە بکەن بۆچی نەوەکانی پێش ئەوان لەم ڕووەوە کەمتەرخەم بووینە؟ بۆیە ئەلێرەوە دەڵێم بەداخەوە شاعیرەکان جگە لە شیعر چیرۆکنووسەکان جگە لە چیرۆک شتێکی دیکەیان نەداوەتە دەست، کە ڕەنگەئەمەش ئەوە بسەلمێنێ ئەوان بە سوتفە چووبنەتە سەر ئەم دوو ژانرە ئەدەبییەوە، ڕەنگە هەمدیس ئەوە بسەلمێنێ کە هۆی نەبوونی شاکاری زۆر هەر ئەو دوورە پەرێزییە بێت لە کاری بەرهەمهێنانی تیوربەندی .

٤

بە درێژایی چەندین دەیە ساڵ شیعریی کوردی نەیتوانیوە کاریگەرێتی خۆی ئەکتیف بکات، بەو مانایەی کە بڕێکی کەم بەتەنها ناتوانێ بە ئەکتیفکردنی کاریگەرێتی شیعری کوردیی بگرێتە ئەستۆ، داهێنانی شیعری کارێکی تاکخوازە

بەڵام کارایی ئەم کاریگەرێتییە پەیوەستە بە چەندێکی زۆرەوە، شیعری کلاسیکی کوردی بە درێژایی چوارسەد ساڵ و بەبوونی چەندین شاعیری گەورەی وەک جزیری و ئەحمەدی خانی و نالی و مەحوی و وەفایی و حاجی قادرو مەولەوی و تەیران و نەوەی دووەمیان، ئەنجا توانییان کاریگەری خۆیان زاڵ بکەن و جاویدانی ببەخشن بە تێکستەکانی خۆیان، هەرواش نەوەی سێهەمی دوای ئەوان کە توانییان لەکاری نوێکردنەوەدا جۆرێک بەشوێن پێی ڕەوتی چۆنییەتی کارکردنی ئەواندا بڕۆن . هەربۆیەش ئەو تۆزە داهێنانەی کە بۆ ماوەی ئەو سی ساڵەی دواییە هەیە ڕەنگە لەنێو تەپوتۆزی ئەو بێهوودەییەوە کاریگەرێتی نەمێنێ و لەبیر بچن . دەخوازم بڵێم شیعری ئەم سی ساڵی دوایی نەیتوانیوە بەردەوام لە بەر دیدو بۆچوونی خوێنەرانێکی زۆر بێت وەک شیعری کلاسیک کە تاوەکو ئێستاش شوێنێکی زۆری لە زەینی خوێنەر دروست کرووە و هەمیشە دەخوێندرێنەوە .

٥

ئەمەی ڕابردوو نائومێدمان ناکات چونکە داهاتوو کاری ئارکیولۆژی خۆی دەکات، ڕەنگە ئەوە پەنجا ساڵ بێت شیعر کەوتبێتە ژێر باری وەلامدانەوەی هەندێ پێداویستی ڕۆحی و کۆمەلایەتی و سیاسییەوە، کە ئەمە هەڵەیێکی گەورەیە دەرهەق بە شیعر، چونکەشیعر بەدوای خوڵقاندنی فەزای جوانی و مەعریفەی ون و فەلسەفەی کاریگەرێتی دا دەگەڕێ و ئاڵۆزییەکانی دەنووسێتەوە کە پەیوەستن بە هەراسانکردنی ڕۆحی مرۆڤی هاوچەرخ و هەرگیز ڕێنیشاندەر نەبووە، ئەم حاڵەتە بەهەمان ئاراستەو بەهەمان شێوە بەردەوام بوو بەلام لە ناوەڕاستی هەشتاکان شێوەی بیروبۆچوون و لێکدانەوەی شاعیران خوێنێکی تازەی هەڵسووڕاندە ناو جەستەی شیعری کوردی و بابەتەکان بەرەو مەعالیمی تازە دەچوو بەلام بەداخەوە لەوێش هەمدیس نەچووە ناو قوماشی تۆمارکردن ئەگەر چی فۆرمی جیا جیا و قسە و جیهانبینی زۆری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو کە دەکرێ لەچەند خاڵێکی گرینگ گەلاڵەی بکەین

– سەرهەڵدانی کۆدەنگی لە ڕووی چوون بەرەو هەرێمە شاردراوەکانی شیعر
– بەجێهێشتنی قۆناخی لالانەوە و شین و شەپۆڕ



– سەرهەڵدانی دیالۆگێکی ڕۆژانەی گەرم وگوڕ لە مەڕ مەسەلە گرینگەکانی شیعر
– پەیوەستدانی هەموو ژانرە ئەدەبی و هونەرییەکان بە تەوژمی تازەکردنەوە
– سەرهەڵدانی ترس لە بلاوکردنەوەی شیعر بە شێوەیێک کە شاعیران لەبەر خوێندنەوەی زیرەکانەی ئەوانی دی زۆر بە وریایی و ئاگا لە خۆبوونەوە شیعریان بلاو دەکردەوە
– هاتنەکایەوەی ڕەخنەی تازە کە بابەت و بۆچوونەکان و هەڵگری جیاوازی بوو
– شاعیرەکان کەوتنە ئەوەی کە جیهانبینی تایبەت بەخۆیان هەبێ .
– لە هەمووی گرینگتر دارمانی میتۆدی سەلەفییەت بوو لە شیعر

٦

هەر لەدوای کۆتایی هاتنی هەشتاکانەوە و سەرهەڵدانی قۆناخی ڕزگاری نەتەوەیی، وەک چۆن لەسەرەتای سالانی هەفتاوە کە قۆناغی وچانی سیاسی وەستانی کاتی تفەنگ بوو شیعری کوردی کەوتە سەر ئاوازی حەماسەت و درووەو لالانەوەو پیا هەڵگوتن دووبارە شیعری کوردی تازە کەوتە سەر ئاوازی مۆد و پۆرترێتی ڕابردوو و لاسایی و گەمەی سەقەتی زمان و ڕەتابەتەوە، زۆربەی شاعیرەکان خۆیان گۆشەگیر کردو نەوەی تازە دەستی بە نمایشی گەنجانەی خۆی کرد، بێ ئەوەی زەحمەتییەک بدەنە بەر خۆ و هەوڵێک بدەن بۆ بەهێزکردنی ئەزموونی تازەی خۆیان، لەمەشدا تێکڕای میدیاکان و ڕۆژنامەکان ڕۆڵێکی نێگەتیفیان بینی لە کوژاندنەوەی سەرهەڵدانی شیعرێکی بەهێزی هیومانیزمی کە هاوشان بێ لەگەڵ تەواوی پەرە سەندنەکانی ئەو قۆناغە، بۆیە هەمدیس ئەدەبیاتی کوردی بە گشتی بەر لەوەی گەورە بێ پیربوو، بەم جۆرە لە نێو ئەم قۆناخە شیعرییەدا دەنگی جیا جیا و دوور لەیەکگەیشتن سەری هەڵدا، نەوەیێک لە سەرەتای زەحمەتی و خۆ ڕۆشنبیرکردن و بەشداری کردنێکی ئەکتیف لە قۆناخی خەباتی چەکداریدا، لەگەڵ نەوەیێک کەبەرهەمی شکست و تێکشکانی شۆڕش و نائومێدییەکانی نەتەوەو ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دڕندەترین دیکتاتۆری سەردەم و هەڵگری شوناسێکی ڕۆشنبیری و کتێب، لەگەڵ نەوەیێک کە بەرهەمی ئەو دوو نەوەیە بووە و نەوەیێکی

كەمئەزموون و گەرم كەچی گەورەترین كتێبخانە وبڵاوكراوەو میدیای لە بەردەستایە، هەرسێ ئەم نەوەیە لە ناو ڕەوتێكی خاوی دوور لەگەرموگوڕی ساڵانی پێشوو لە جوولەدان بێ ئەوەی گۆڕانێكی ئەوتۆ لە بوارەكانی تۆماركردنی شاكارو داهێنانی بە پێز لە ئارادابێ، جگەلە هەوڵی چەندانێك نەبێ كە ئەوانیش لە ناو هەراوزەنای ئەم ڕەوتە سڕبووەدا خەریكە دەخنكێن یا ئەوەتا بە ناچار پەناگیر دەبن .

٧

– ئایا لەنێو كۆمەڵگەیێكی دواكەوتودا داهێنەری گەورە دروست دەبێ تا ئێمە باس لە تازەبوونەوەو تازەگەرایی بكەین ؟

– ئایا ئێمە دەتوانین باس لە پرۆژەی مودێرنیزم و پۆست مۆدیرنیزم و مۆدێرنێتە بكەین لە سەر زەمینێك كە تا تەوقی سەری نوقمی حەكایەتە گەورەكانی پیرۆزی و قودسییەت بووە ؟

–ئایا هاتنەكایەوەی شاكاری گەورە گەورە بەندە بە پەرەسەندنی باری سوسیولوژی و ئابووری و سیاسی و سەرهەڵدانی دەوڵەتی نەتەوەیی و هەبوونی كولتوورێكی لە پێشینەی لێوانلێو لە داهێنان و شاكار یاخود داهێنان بەندە بە هەوڵی تاكەكەسی و بەس یا هەبوونی كولتوور و هەوڵی تاكە كەسی بەیەكەوە بەندن؟

– ئایا پێشكەوتن و سەرهەڵگەڕانی بزاوتی شیعریی پەیوەستە بە فرێدانی هەمیشەیی پرسیار یا بە شێوەیێكی دیكە ئایا شیعری كوردی بەدرێژایی ساڵانی هەفتاكانەوە بەرهەمهێنەری پرسیار بووە ؟

ئەمانە هەمووی كۆمەڵە پرسیارێكن دەبێ وەڵامیان بدرێتەوە، بەڵام بەداخەوە لە سێ دەیەی ڕابردوو تاوەكو ئێستا هیچ كارێك لە سەر خودی ئەم پرسیارانە نەكراوە هەربۆیەش تا ئێستا هیچ كلتوورێكی ڕەخنەییمان لە بەردەستدا نییە تا ئەوانەی دواییش كاری لە سەر بكەن .

٨

لە بنەڕەتدا شیعر هەڵگری دیدگائێكی پێچەوانەو جیاوازخوازییە لەگەڵ جیهان واتە– هاوكێشەكانی خۆی لەسەر پیلەكردن لەگەڵ جیهان و ژیان دادەڕێژێ،



هەركاتێ شیعر لەگەڵ بویەر و جیهاندا كۆك و تەبا بێ ئەوە مەرگی جیهانبینی شاعیر ئاشكرا دەبێ، بۆیە شیعر هەمیشە لە ململانێ و كێشەو پرسە لەگەڵ دەوروبەر، هەمیشە هەوڵ دەدات خوێنەر بەو ئاقارانەدا پەلكێش بكات كە تژی گومان و نیگەرانییە، لەڕاستیدا شیعر جگە لە خوڵقێنەری گومان هیچی دیكە نییە، گومانێك كە بەرهەمهێنەری سەرسامی و پرسیار بێ لە خودی مرۆڤ و گەردوون و شاراوەكان و دۆزی هەمان ئەو گینگلانە بێ كە بەدرێژایی بوون ڕۆحی مرۆڤیان هەراسان كردووە، هەرگیز شاعیر ناتوانێ بەبێ جیاوازبوون لەگەڵ جیهان شیعر بنووسێ ئەگەر هەوڵی ئەوە نەدا كە شیعر بەناو شەبەنگی هەزار ڕەنگی دژەڕێسای جیهاندا نەبات، چونكە لەوێ دەتوانێ قسە لەگەڵ نهێنییەكانی خۆی بكات و لەوێ دەتوانێ تیما مرۆیییەكانی شیعر بدۆزێتەوە، ئەگینا شیعری كوردی هەر لەو سێبەرە تۆخەی خۆی دەمێنێتەوە و ناتوانێ شاكارێ ڕەنگڕێژ بكات .

٩

ئەگەر چی لەم سی ساڵەی دواییدا دەنگی جیاجیای شیعری كوردی سەری هەڵداوە و هەریەك لە ئاوی میتۆدێكی شیعری دەخۆنەوە، بەڵام سەرەڕای ئەم جیاوازییە دیسان بەبێ خوڵقاندنی كاریگەرێتی گشتگیر هاتووەو زیاتر گەمەكردنەلە فۆرمی جیاجیای زماندا، كە پێویستیان بە شارەزاییكی زۆری ناو زمان و فیكرو مەعریفە و ئێستەتیكاوە هەیە كە كەمتر بەر چاو دەكەوێ، ئەمەشیان دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی تێڕامان و دامان لەو ناوەرۆكەی كە دەیانەوێ بیكەنە تێزی شیعری خۆیان، هەر بۆیەش لەم سی ساڵەی دواییدا ئەوانەی كە هەوڵیان داوە شیعری باش و خودان كاریگەرێتی گشتگیر بڵاو كەنەوە بە پشت بەستن بەزمانێكی پتەو و خوێندنەوەی فیكرو مەعریفەیێكی زۆرەوە، توانیویانە هەڵگری قەدەرێك لەو پێداویستییانەی شیعر بن و لە ناو ڕەوتی شیعر بە دیاركەون .

١٠

شیعر و دروود ڕەگەزی هاوبەشیان هەیە بەوەی كە هەردووكیان پەیگیری شتێكن شاراوە و نادیار، هی یەكەمیان تیما و بیرۆكەیەو لە وشەو رستەدا بەرجەستە

دەبێ، هی دووەمیشیان لە سیمای خوداوەنددا، هی یەکەم ئەندێشەی قووڵی شاعیر حوکمی دەکا و هی دووەمیش باوەڕی بەتینی عابید، پەیامی شیعر گەڕانە بەدوای ئایدیاییێک کە خوڵقێنەری شاکارو داهێنانە وا لە شاعیر دەکات بۆ تا هەتا جاویدان بێت، پەیامی دروودیش گەڕانە بە دوای خودا کەخوڵقێنەری چارەنووسی بەختەوەرییە لە ئێستا و دوای مەرگ، بەم جۆرە نەمریی ڕەگەزی بەهێزو هاوبەشی نێوان شیعرو دروودە و قسە کردنە لەگەڵ غەیبدا، واتە غەیبانییەت خەسڵەتی هەرە دیاری شیعرو دروودە .

١١

شیعر بەخشندەی ئاگاهییە، بێ بوونی شیعر لە نێو کپی و وەستانێکی ئەبەدیدا ژیان بەسەردەچێ، ئێمە پێویستیمان بە ژانرێکە بەرهەمهێنەری زیندووکەرەوەی دەمارەکانی ڕۆح و دڵ و هزر بێ، کە شیعریش لە تواناو بڕستیدا هەبێ ئەم کارە بالایە بکات دەبێ شکۆمەندی ڕاگرین، هەربۆیەش شیعر هەڵگری جۆرێک لە قودسییەت و پیرۆزییە کە لە قودسییەت و پیرۆزی خوداوەندی دەچێت، جا ئەوانەی کە پەییان بەم پیرۆزییە بردبێ، نووسینی شیعر لای ئەوان کارێکی ئەستەم و دژوارە، بەبێ ئەزموونێکی بەتین توخنی شیعر ناکەون، چونکە باش دەزانن لەکاتی کاربەرداری نووسینەوەی سرووتی پیرۆزی خەڵقکردن شوکرانە بژێری تیماکان دەکەن.

١٢

شیعر هیچ زەمەنێکی دیاریکراوی نییە، ئەوەی کە شیعری زاڵ کردووە بە سەر زەمەندا ئەوەیە، کە شیعر خۆی خوڵقێنەری زەمەنی خۆیەتی لە ڕێگەی داهێناندا، دەخوازم بڵێم شیعر ڕەهەندی چوارەمی زەمەنە کە هەموو ئێستا و داهاتوو لەناو وشەدا کۆدەکاتەوە بۆ دەربازبوون بۆ ناو دەرەوەی زەمەن و دەسگیر کردنی ڕەهایی چونکە شیعر دەبێ بوونەوەرێکی ئازاد بێ .



١٣

شیعر پێویستی بە فیکر و مەعریفەی ڕەها هەیە بەڵام شیعر فیکرو مەعریفە نانووسێتەوە، بەڵکو وردو خاشیان دەکات و دەیانکات بە سووتووی تێڕامان و گوزارشتکردن لە هەراسانی ڕۆح و جاویدانی.

١٤

شیعری باش هەموو پێناسەکان بەتاڵ دەکاتەوە و هیچ چەمکێکیان بۆ ناهێڵێت .

١٥

فۆرم و ڕیتم زمان و ناوەرۆک لەناو هەڵڕژانێکی ئەبەدی شیعریدا ئاوەها بەیەکەوە بەندن، هیچ هێزێ نییە بتوانێ لەبەر یەکیان هەڵوەشێنێتەوە ئەگەر شیعر بە ئومێدی جاویدانی داڕێژرابێ .

١٦

شیعر لە دەرەوەی تەکنیکی مێژوویی مێژووی تایبەت بە خۆی دروست دەکات، مێژوویێک تژی لە شەڕە قورسەکانی مانا، ئەو مانایانەی هەمیشەو بێ وچان مرۆڤ لە قاڵبە متبووەکانی خۆی ڕەها دەکات و دەیخاتەوە ناو فۆرمە جیاجیاکانی ئازادی، ئەو ئازادییەی هەموو فەزاکان لە بەردەم گوزارشتی مرۆڤایەتی دەکاتەوە و ڕێگە شاراوەکانی داهێنانی گەورە لە بەردەم شاعیرەکان دەکاتەوە و خوێنەر بەرەو دونیاییێکی جوانترو کراوەتر دەبەن، بەم جۆرە _مانا–رەهایی _ ئازادی _ دەبن بە سێ ئەقنومی مێژووی شیعر و قوداسی داهێنان پڕ لە سرووتی مانەوەی هەتا هەتایی دەکەن.

١٧

گۆڕان گرینگترین ئەکسیری شیعرە، شاعیر بەردەوام دەبێ لە پێناوی ڕۆح بەخشین بە جیهانبینی خۆی لە گۆڕان دابێ، گۆڕانێک بەرەو لووتکە، گۆڕان لە ستایل و مانا و فۆرم و وشە و ڕامان داڕشتن، بەم جۆرە شاعیر دەتوانێ فەزاکانی

داهێنانی شاکار کەشف بکات، شاعیری وەستاو بە تەنیا خاوەنی ئەو ساتەیە کە تیایا دەژیت و نابێتە خاوەنی جاویدانی.

١٨

کاری شیعر تێپەڕاندنی ستایلە تەپیوەکانە، ئەو ستایلانەی بەدرێژایی چەندین دەیە ساڵە بوونەتە مۆتەکەی سەر سینەی شیعری کوردی، نەهێزی ئەوەیان هەیە وەهمێک دروست بکەن لە حەقیقەت بەهێزتر بێت، نەوەهمی ئەوەیان هەیە هێزێک دروست بکەن بۆ شیعر توانای دینامیکییەتی هەبێ، ئەوانە ئەو ستایلانەن کە وەستاون، چونکە نەلەڕووی زمان هێزی دامەزراندنیان هەیە نە لەڕووی ئەندێشە و تێرامان، تا بتوانن بیرۆکە قووڵەکانی شیعر بدۆزنەوە . بۆیە شیعر دەبێ هەڵگری شوناسی تێپەڕاندن و دارماندنی ئەم ستایلانە بێ کە من ناویان دەنێم ستایلی سواو .

١٩

بەیانی شیعر بەو مانایە نییە کە ڕێنوێنی بێت، بەڵکو بەو مانایەیە کە بەشداری بکات لە گۆڕین و تازەکردنەوەی چەمکەکانی شیعر و هەوڵێکە بۆ بونیاتنانی پرۆژەیێکی بەتینی ڕەخنە و تیوریزەکردن، لە هەمان کاتدا شەوقی تاکێکە بۆ نەوەکانی ئایندە .

## بەشی چوارەم

# ژیان لە نێو کتێبدا

١

منداڵی وەکو ئاوێنەیەک وایە لەناو زەینی هەموو نووسەرێکدا بە گۆشت و دەمار و خوێن داپۆشرابێ، ناوە ناوە برووسکەیەک، چەخماخەیێکی ئەم ئاوێنەیە هەموو گیانی دادەگرێ و دەیباتەوە ناو پاوانە دوورەکانی زاکیرە، لە ڕاستیدا هەر داینەمۆی زاکیرەیە نووسەری ڕاستەقینە دروست دەکات دەیباتەوە سەر ئەو ڕەگە پتەوانەی داهێنان لە ژێر پانتاییە قووڵەکانی زەیندا بە هێمنی ڕاکشاون و چاوەڕوانی ئاه و هەنسکی داهێنەر دەکەن، نووسەری بێ زاکیرە هەموو بەرهەمەکانی دەبنە موقەبا، چاکترە بڵێم پەیوەندی نێوان ئاوێنەکەی زەین و زاکیرە بریتییە لە نووسەر و داهێنان، لە دەرەوەی ئەم فەرمۆلەدا هیچ دەقێکی زیندوو نییە، لەنێو دەقی منداڵیدا وێنە و تابلۆی هێجگار زۆر هەن وەکو شووشە هەپروون بە هەپروون بووین و تەتۆکەکانی ماونەتەوەو ناوە ناو دەنکێ لەو تەتۆکانە هاوار دەکا و دەبریسکێتەوە و دەقێکی زیندووی هاوچەرخ دروست دەکات کە دەبنە بەشێکی گرنگ و دانەبڕاوی ڕۆحی مرۆڤی نووسەر، ئەمە لەناو لێکدانەوەی هەموو شاعیرێ هەیە، مەحاڵە شاعیرێ هەبێ لە دەرەوەی ئەم لێکدانەوەیە بتوانێ لە ناو دارستان دەقە جاویدانییەکان دینامیکییەتی هەبێ و دەقەکانی کاریگەر بن، من خۆم لەگەڵ ئەوەدام بەڵام ئەم پرۆسێسە بە تەنها گوزەر ناکا و هیچی لێ نایێتەوە بەڵکو ئەم هەڵکۆڵینە دەبێ هەموو پێداویستییەکانی لەگەڵ دابێ بۆ ئەوەی قووڵایی دروست بکات و دەقی گەورە گەورە مشتوماڵ بکات.



٢

دوور نەڕۆین شوێنزا ئەو پانتاییەیە کە شاعیر لە شوێنێکی بڵندەوە سەیری دەکات و دەزانی زۆر زۆر دوورە دەزانێ ئەو زەمەنە ونبووەیە کە پروست بە دوایدا گەڕاوە، بەڵام بەقەد ئەم دوورییە کاریگەری خۆی هەیە، چونکە شوێنزا یاخود زادگا هۆیەکە بۆ ئەوەی نووسەر هەڵگری شوناس و کولتوور دیسکرایبی ئەو شوێنە بێ، چونکە زادگا دروستکەری خوێن و ئێسقانی نووسەرە، نووسەر بۆ یەکەمین جار لەو زادگایەوە سەیری جیهانی کردووە و جیهانبینیێکی چکۆلانەی بۆ خۆی دروست کردووەو وردە وردە گەورەی کردووە و پەڕ و پۆی داوەتەوە و مامەڵەی لەگەڵ ژیان و نووسین پێ کردووە.. کاتێکیش نووسەر دەزانێ تا دێت لە یۆتۆپیکە دوور دەکەوێتەوە ئیدی کەڵبەی نامۆیی و غوربەت ژینی دەیهاڕێ و هێندەی دیکە ئەڤینی بۆ ئەم شوێنزایە زێتر دەبێ.

بۆیەش ئەدەبی نامۆ یاخود نامۆگەرایی لە ئەدەب دروست بووە کە بەشێکی گرینگی دەگەڕێتەوە بۆ دۆڕاندن و لەدەستچوونی زادگا، زادگا هیچ کاریگەرێکی نابێ لەسەر دەق ئەگەر خاوەنی دەق زۆر زیرەک و وریا و کرێشمەباز نەبێ، چونکە گەڕاندنەوەی زادگا بۆ ناو زەین و مێشک پرۆسەیەکی زەحمەتە بە هەموو کەس ناکرێ، وەک ئەوەیە کە ئەدەب و دەقی داهێنان دووبارە بەرهەمی بهێنینەوە، بەرهەمهێنانەوەی زادگا وەکو خۆی خەونێکی خۆڵەمێشییە.. بەڵکو دەبێ بە ئێستاتیکا و پەڵە و گەورەیی و هێزەوە بەرهەمی بهێنینەوە، ئەو کاتە دەقی لەسەر دەخولقێ.

هەڵبەت تۆ لەو زادگایە جوانترین و خۆشەویستترین ئازیزی خۆت جێهێشتووە کە تێکەڵی خاک و خۆڵی بووە، جوانترین نەشمیلت تەسلیمی ناو خۆڵی کردووە، پڕە لە نهێنییەکانی تۆ، پڕە لە ئەو خەونانەی کە تۆ بینیوتە و لە ناو پووش و پەڵاش و بەردەڵانەکانیدا هەڵوەریون و ئێستا وەک شووشەی بەر هەتاو دەبریقێنەوە، شەڕەکانت، دەست لە مەلانێکانت، گریان و فرمێسکت...هتد هەمووت لەناو ئەو پانتایە جێهێشتووە کە پێی دەڵێن زادگا.. ئەمانە هەمووی دەبن بە بنەمای دەقە زیندووەکانی شاعیر.. سەیرکە مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی لە ئەڤینی شوێنزادا، چۆن

ئەڤینێکی بۆ مەعریفە دروست کردووە لە عیشقی شەمس دا بە تایبەت لە ناڵەی نەیدا، هەرواش نالی لە ئەڤینی شارەزووردا.

٣

من زۆرجار بیر لەوە دەکەمەوە، ئایا ئەوە خۆمانین کە [پیشە] بۆ خۆمان هەڵدەبژێرین لە ژیاندا، یاخود شتێکیتر هەیە لە سەرووی ئێمەدا ڕێڕەوی تێپەڕاندنی زەمەنمان نیشان دەدات، بۆ نموونە : تۆ بۆچی بوویت بە نووسەرو شاعیر و وەرگێڕ؟ بۆچی کارێکی ترت هەڵنەبژارد، خۆ بە هەزارەها پیشە هەن لەسەر ئەو ئەستێرەی ئێمەدا؟ ئایا کەسێ هەیە پێت بڵێ من پیشەی نووسینم هەڵبژاردووە؟ نووسەریی و کاری زەینی هەڵبژاردن نییە، بەڵکو کەوتنە سەرە، چەقین و ئاسێ بوونە وەک ئەوەی تۆ لەناو بایێکی سەخت ئاسێ ببی و هەرگیز ڕەهایی نەبینی، نووسەرایەتی قەدەرێکە یاخود قەدەرە مرۆڤ تووشی دێت، ئایا چ شتێ لەوە سەختتر هەیە مرۆڤ بیر بکاتەوە؟ ئایا لە بیر کردنەوە سەختتر هەیە؟

بۆیە من دەتوانم بڵێم نووسین و نووسەری ئەسڵەن پیشە نییە تا لە مەیداندا بە دوایدا بگەڕێین، بەڵکو ڕاوکردنی ئێستاتیکایە، ڕاوکردنی تەئەمولە، ڕاوکردنی ئەڤین و ئەو ساتە ونبووانەیە کە مرۆڤ لە دەستی چووە، دەیەوێت بیگەڕێنێتەوە، ئایا هەڵبژاردنی ئازار و چەشتنی چاوەڕوانی و ئەشک و ئێشکگری پێی دەگوترێ پیشە؟ بۆیەش من پێم وایە کاری نووسین دوورە لەم جۆرە لێکدانەوەیە، چونکە یاریکردنە بە دڵ، یاریکردنە بە خڕۆڵکەی مێشک.. نووسین کتومت کاری ئەو مرۆڤەیە کە دەچێتە ناو جەنگەڵێکی سەخت و دژوار و شەوەزەنگ، کاتێکیش هەنگاو بۆ ناو ئەو جەنگەڵە دەنێت ئیدی تازە گەڕانەوەی بۆ نییە، ئەوسا لەوێ لەناو ئەو هەموو درەختە هەزار ساڵییانە ئەگەر بتوانێ باس لە گەڵایێکی وەریو بکات.. یا لە بن سێبەری کاژێکا بیر لە بیابانە دوورەکانی ڕۆحی مرۆڤ بکاتەوە و دەقێک بنووسێ.

٤

مەرج نییە هەتا نووسەری زۆر ڕاستەقینەش، دوای دابڕان لە نووسین یاخود دەست هەڵگرتن لە نووسین دووبارە بگەڕێتەوە سەری و هەمان ئەو میحنەتە



هەڵبژێرێتەوە، چونکە عەشق هەر بە تەنها لە جاری یەکەمی سووتان و هەڵڕژانی هزردا وێڵبوونی بەدواوەیە، بە تەنها هەر عەشقی یەکەمە سەرچاوەی داهێنان و هەڵکۆڵینە هەر وەکو [ابن عربی] دەڵێت: تەنها یادەوەری یەکەم هەر ئەوە کە ڕاست بێت.. هەر بۆیەش یەکەم پەیوەندی بە نووسینەوە هەر ئەوە داهێنەری گەورە دروست دەکات کە یەکەمین ئەشقە، تەنها عەشقی یەکەم جاویدانییە و لەناو دڵ و خوێنی عاشقدا وەکو پشکۆی ئەزەلی دادەگیرسێ و کوژانەوەی بۆ نییە، جا بۆ ئەوەی نووسەر بۆ تاهەتایە لەنێو ئەو عەشقە ئەبەدییە بژیت دەبێ هەوڵی مانەوە بدات و لەناو دێڕو وشەو ڕستەی ئەدەب و شیعردا جاویدانی و بەردەوامی بۆ خۆی بونیات بنێت و بۆ ساتێکیش بیر لە دابڕان نەکاتەوە ئەگینا هەموو شتێکی لە دەست دەچێ.

شاعیر ئەو کاتە دابڕانێکی گەورە لە میانی خۆی و دەوروبەری دەکات کە بەردەوامی بە هەڵکۆڵینە مەینەتییەکانی خۆی بدات و وردە وردە ئاوڕ لە ئەزموونی خۆی بداتەوە تا بزانێ ئێستا چۆنە و یەکەم عەشقی چۆن بووە.. نووسین سەردەمی عەشقێکی ئەبەدییە لە ئاگردانی بیرۆکەیێکی شیعری یا چرکەیێکی گریان یا ژیلەمۆی ناو دڵەوە دەست پێدەکات و هەتا دێت هەڵدەچێ و بەرەو تەبەقەکانی سۆفیستیانەی دانتی هەڵدەکشێ. یاخود وەکو قەقنەس دەسووتێت لە خۆڵەمێشی ئەڤینی خۆیدا زیندوو دەبێتەوە ڤڤزز تۆ سەیرکە نووسەری ڕاستەقینە و شاعیری گەورەو تەواو وەکو ئەو باڵندە خورافییە وایە کە ئاوەها گۆرانی دەچڕێ و دەچریکێنێ.. ئاگای لە خۆی نامێنێ و هەر بەرز دەبێتەوەو بەرزدەبێتەوە تا ئەوەندە لە خۆر نزیک دەکەوێتەوە دەبێتە خۆڵەمیش.

جاویدانی کاری نووسین هەمدیس هەروەک ئەو باڵندەیەیە کە بەر لەوەی ئەو گۆرانییە مەزنە بچڕێ هێلکەکانی خۆی بەرهەڵای ئاسمان دەکا هەر لە ئاسمان دەبتەوە و نەوەی تازەیان لە ئاسمان لە دایک دەبێ.

## بەشی پێنجەم

# گەمەی ئاوێنە و ماسکەکان

١

ماسکی ڕەش:

تۆ خاوەنی ئەو دڵەی کە ڕەنگی ڕەشی خۆی داوەتە ڕوخسارت و هێندە لە ناخەوە تووشی دڵەڕاوکێ و بەد ڕەفتاری و وەسوەسەی نەفرەتی بوویت کە ئیدی لەناو گیانت شوێنێ نەماوە بۆ پەڵەیەکی سپی بۆیە ناچار بەشێکت گواستۆتەوە بۆ ئەو ماسکە و خۆتی پێ دەشاریتەوە، خۆ شاردنەوە لە پشت ماسکی ڕەشدا هەتا بۆ کاری هونەری و کەرنەڤالاتیش بێت، خۆ شاردنەوەی ڕاستەقینەی پێکهاتەی ڕوخسار و ناوەکییەکانی مرۆڤە، بۆیە ماسک ڕەت دەکەمەوە.

٢

ماسکی شین:

تۆ خودانی ئەو دڵەی کە ڕەنگی خۆشەویستی خۆی داوەتە ڕوخسارت و هێندە لە ناخەوە تووشی دڵنیایی و کرداری چاکی و دڵنەوایی بوویت کە ئیدی لەناو گیانتا شوێنێ نەماوە بۆ پەڵەیەکی ڕەش، بۆیە ناچار بەشێکت گواستۆتەوە بۆ ئەو ماسکە و خۆتی پێ بەرەلا دەکەیت ئاشکراکردنی خۆت لە پشت ئەو ماسکە شینە هەتا بۆ کاری هونەری و کەرنەڤالاتیش بێت ئاشکراکردنی ڕاستەقینەی پێکهاتەی ڕوخسار و ناوەکییەکانی مرۆڤە، بۆیە من ئومێدم بە تۆیە ئەی شین کە تۆ بەشێکی لە ئاسمان و بەشێکی لە دەریا و بەشێکی لە پاوانی ئەڤین و خرخاڵی پێی منالانی.

لەبیرمە من خۆم پیرۆزەییم بۆ منالان دەکڕی و لە ڕستەیەکی بازنەیی جواندا لە پێی منالانم دەئالاندو دڵم هێور دەبۆوە، هەمـوو ئاواتە شین و جوانەکان دوورن لە





ڕاوکردن و بەدەستهێنانی ئاسان.. دەبێ قوربانیان بۆ بدەین، زاتی خۆمانیان بۆ بکوژین تا بە دەستیان بهێنین و شەونخوونی شیعرئامێزیان بۆ بکەین تا لە کەنارە شینەکانیان وچانێ بدەین.

٣

ماسکی سوور:

ئاخ دیسان ماسک، بە تایبەت ئەی سوور تۆ تەنها بۆ ئەوە گەورەیت کاتێ لە جەستەما لە پێناوی ئەڤین و عەشقدا هەڵدەڕژێی، لە پێناوی بەهاکانی ژیان ئەڤینژینی، لە کاتی ئەوەی کە دوژمنانی خاکم هەوڵی کوشتنی هەناسە پڕ لە سۆزەکانی ماملێ دەدەن هەوڵی تیرۆرکردنی گەنجە جوانەکانی وڵاتەکەم دەدەن، ماسک هێزی هەڵگرتنی چەمکی تۆی نییە ئەی سوور ئاخر کەڤرێ نەماوە بە تۆی نەنەخشێنم، ئەی سوور تۆ ئەو جۆگەلانەت لە کەناری قژ و باڵای خۆشەویستەکەم دروست کردووە کە پڕن لە هەڵاڵە، پڕن لە خەونی وچان و ژیلەمۆی گۆرانی.

٤

ماسکی خۆڵەمێشی:

شیعر بەشێکی گەورە لە ڕۆحی شاعیر دروست دەکات، بەڵام ئەو شیعرە خۆڵەمێشییانەی بەبێ سووتان دروست بوونە ئەوانەن ئەو ماسکەم لەبەر چاو دەخەن و ڕۆحم پڕ لە خۆڵەمێشی بێزاری دەکەن، هەرگیز خۆڵەمێش ناتوانێ ڕۆحی مرۆڤ شاد بکات، تەنها ئەو ساتانە نەبێت کە دەبێت بە شیعرێ دوای هەزاران ئاگر دێتە کایەوە، دوای هەزاران پەڕینەوە لە تەلبەند و سنوورەکانی ئەڤین، دوای کوشتنی زات و خولقاندنی کۆمارێک لە عەشق، هەرگیز دڵی خۆم بۆ شیعرە خۆڵەمێشییەکان ناکەمەوە، هەر بۆیەش هەموو ئەو ماسکانەی کە ڕوخساری ڕاستەقینە دەشارنەوە و بێ هەیبەتن ماسکی خۆڵەمێشین.. ئەی ماسکی خۆڵەمێشی تۆ تاراییکی ناحەزی، جوانییەکان دەشاریتەوە.

٥

ماسکی سپی:

تا هەرگیز لەوە ناوەشێتەوە ئەی سپی تۆ بۆ ماسکەکان بشێیت، تۆ سیمبۆلی پاکیت، تۆ ڕەمزی حیکمەت و هێمنیت.. بۆیە تۆ دەبێ ڕۆحی شیعر بیت، هاواری دڵنەوایی و بێدەنگی و سەفا بیت، هەموو شتە جوانەکان لە ڕۆحێکی سپی و بێگەرد دا شەوقی خۆیان دەبەخشنە ئەم کەونە.. ئەوانەی ڕەنگی تۆ بۆ ماسکە قولابییەکان هەڵدەبژێرن ئەوانە دەیانەوێ بەدناوت بکەن و لە ڕیزی شیعری پاکدا لات بدەن، بۆ ئەوەی هەم ماڵی تۆ هەم ماڵی شیعر وێران بکەن، وەرە سەیری پاپۆڕە سپییەکانی سەر دەریا دوورەکان بکەن چۆن پەمۆی عەشق دەگوازنەوەو لە دوورەوە ڕۆحت پڕ لە هێمنی دەکەن، یا شیعری سپی پۆل ڤالیری یا فریشتە سپییەکانی هاودەمی دانتی .. هەموو بەهرەی خوداوەندی هەڵدەڕێژنە ڕۆحی مرۆڤەوە، کەواتە:

سپی: یانی خودا یانی سەفا

سپی: یانی نەرگزجاڕ

سپی: یانی مەلێک لە کاتی ئاوخواردنەوەدا

سپی: یانی لقێک کە چرۆ دەکا

مانگێگ کە لە لووتکە هەڵدێ.

دەمێک کە دەچێتە دەمی ئافرەتەوە.

٦

ماسکی پرتەقاڵی:

ئێستاش بوخچەکانی دایکم بۆنی ئەو پەلکە پرتەقالانەیان لێ دێ کە بەر لە سەدەیەک بۆنی کراسی منداڵیمی خۆش دەکرد.. هەمیشە هاودەمی ئەو قەرنەفولە وشکەوەبووانە بووە کە دەستی پیرۆزی دایکان بە موقەدەسیان دەزانی، ئێستاش ئەو شەڕە جوانەم نەبینییەوە کە لەو پەڕی تووڕەییەوە بە پرتەقاڵ وەشاندن دەستی پێکرد و بە بۆنی خۆشی تەوقە کۆتایی هات، ئای چەند خۆشی بوو کە لە ئەنجامی



ئەو شەڕەدا پرتەقاڵ دەباری و دونیا پرتەقاڵی هەڵگەڕابوو، ئێمەش لەو شەڕەدا تێر پرتەقاڵ بووین.. خودایە شەڕەکان هەر بە پرتەقاڵ بن، کە ئەمەش بۆتە هەوێنی شیعرێکم بە ناوی شەڕە پرتەقاڵ.

٧

+ ئەو کاتە وەک هەلەکۆکەی کە چوزەرە دەکا و بە درێژایی ژیانی لە چاوەڕوانی خۆرەتاودا گۆرانی بۆ ناخی زەوی دەڵێ، بەڵام کاتێک سەر دەردێنێ خۆرەتاو لە تاقی ئاسمانەوەیە ئەو کاتەش بەفرێکی خەستی بەسەر دادەبارێ و هێدی بە حەسرەتی خۆرەتاوەوە سەردەنێتەوە، هەرگیز نابینێ ئەمە نائومێدیێکی سیزیفییانەی حەقیقی ترە لە ئەفسانە، ئەو کاتە منیش کە لەبەر ئاوێنەوە دەوەستم دەمەوێ کەنارە دوورەکانی خۆم ببینم و بەهەزاران جار بەبوراقی شیعر بە باڵای ئاوێنەکانەوە ڕادەمێنم.. بەڵام ئاخ ئەوە سەرم هەموو سپی بوو، ددانەکانم یەکە یەکە ماڵئاواییم لێدەکەن کەچی کاتێک دەگەمە ئەوەی ناخی خۆم ببینم ئاوێنەم لێ وردوخاش دەبێ و هاوار دەکەم:

داد هەی بێداد ئەمە چ وەرزێکی سەختە؟

داد هەی بێداد ئەمە چ تۆفانێکی پڕ حەسرەتە؟

داد هەی بێداد ئەمە چ شیوەنێکی گەرمە؟

ئەوسا ئاوێنە شکاوەکان لە ژێر لیتاوی عومردا ترووسکەیەکم بۆ ڕەت دەکەن، پێم دەڵێن :

کە هاتی بەهار بوو

ئێستا خوناوەی بەفر بە سەر قژتەوە باریوە

پاییز بەسەر پەرچەمی گەڵاکانەوە

جریوەی دێ و

ها ئەوە ناخی تۆیە لە شەقەی باڵ دەدا..

ماڵاوا..

٨

روخساری جوانەکان ناشێوێنرێن، مەحاڵە ئاوێنە تەڵخەکان بتوانن سیما پەپوولەییە سپییەکان بشێوێنن.. ئەوان ئەو ئومێدە لەگەڵ خۆیان بەرەو گڵ دەبەن..

خودایە ئەوەی هەوڵ دەدا بمشێوێنێ ..
دڵی پاک بکەیتەوە، بەڵکو لە عەشق و
خۆشەویستی من .. شێت دەبێ..
خودایە ئەوەی بەردی کوێر دەگرێتە من
دەستی پڕ لە نەرگز بکە
تا لە بۆنی پاکی دۆستایەتی غەرق بێ.

٩

ئاوێنەی غروور:

+ بەو مەغرووورانە دەڵێم:

هل فرشت العشب ليلاً
منزلاً دون القصور
وتتبعت السواقي
و تسلقت الصخور؟

ئەوەش کە داهێنەرەو بەرهەمی جوانی هەیە هەرگیز مەغروور نابێت.. ئەوانەی تریش با مەغروور بن، خەڵک باس لە غرووڕەکەیان دەکات نەک بەرهەمەکانیان، ئەوانە دەبێ سەیری ئەو مۆمە جوانە بکەن کە وردە وردە لە پێناوی داگیرساندنی ڕۆحی خۆی هەموو ڕووناکییەکان دەبەخشی بە ئەوانی دیکە.

## بەشی شەشەم

# لە ئەزموون و تیوریزەدا

١

+ من پێم وایە هەموو ڕۆمانێ یا هەر نۆڤلێتێ خاوەنەکەی شاعیر بێت یا نا پێویستییەکی زۆری هەیە بە سەلیقە و زمانی شیعری، کاتێک دەڵێین زمانی شیعری مەبەستمان ئەوە نییە نووسەر شیعر بنووسێ، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە سۆز و ئەدای شیعرییەت جۆرە کەش و تەشقێکی تراکتیف ئامێز بۆ دەقەکە خەڵق بکات و ببێتە هۆیێ کە بێزاری خوێنەر بکوژێت، تۆ کە لە ڕۆمان یا نۆڤلێت بتەوێ ببیتە جێی سەرنجی خوێنەران و ڕاکێشانیان ئەوە دەبێ کەرستەیێکی وات پێ بێ کە لە دوورەوە ڕایاندەیە لای خۆت، ئەگینا بە ستایلێکی موقەوایی ناتوانیت خوێنەر بۆ خۆت دروست بکەیت، ئەگەر سەیری پرۆسێسی نووسینی ڕۆمان و نۆڤلێتی جیهانی بکەین دەبینین ئەوانەی کە ستایلی شیعرییەتیان ـ نەک شیعر ـ بەسەردا زاڵە زۆرترین خوێنەری بۆ خۆیان دروست کردووە، بۆ نموونە ڕۆمانەکانی ئایتماتۆف، نووسینەکانی هاشم ساڵح، سۆنێتاکانی شەکسپیر و ڕۆمانەکانی کازانتزاکی و شولوخۆف و زۆرانی دیکە.. ئەوەش بەو مانایا نییە کە دەبێ هەموو ڕۆمانێک ڕەچاوی ئەوە بکات، هەیە توانای بەرهەمهێنانی شیعریەتییان نییە، لە پەخشانە ڕۆمان یا نۆڤلێتی خۆیان، بەڵام ئەم جۆرە مرۆڤانە لە خوێندنەوەیاندا ماندووبوونێکی دیکەیان دەوێت و هەڵسوکەوتێکی زۆرتریان گەرەکە بۆ نموونە ڕۆمانەکانی دۆستۆیۆڤسکی نابێ وەکو ڕۆمانەکانی یەشار کەمال یا فلۆبیر بخوێنرێتەوە، بەڵکو ئاست و هەست و چەشەی جیاجیایان گەرەکە منیش لەو نۆڤلێتانەی کە نووسیومە هەوڵی دروستکردنی شیعریەتم داوە کە زاڵ بێ بەسەر ڕووداوەکان، لە ڕاستیدا بە دەستی ئەنقەست وام نەکردووە، هەر خۆی ستایلی نووسینی پەخشانم وایە و



ناتوانم لێی ڕزگار بم، لە کۆتاییدا ئەوە دەڵێم شیعر سەنتەر نییە بەڵام پەساپۆرتی پەڕینەوەی هەیە بۆ ناو هەموو سەنتەرەکان.

٢

هەرچەندە ئەم بابەتە زۆری لەسەر گوتراوە و نووسراوە، بەڵام هێشتا ئەوە هەڵدەگرێ کە باس بکرێت و شرۆڤە بکرێت، لە ڕاستیدا هیچ شتێ لە مەودای ئەدەبدا پێناسەیەکی یەکجارەکی نییە، بەڵکو ڕا و بۆچوونی جیا جیا و پێداچوونەوەی جیا جیای بۆ دەکرێ و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگۆڕێ، شتێک نییە لەناو زەین و دڵی مرۆڤدا پێی بگوترێ بەهرە، ئەوان دەڵێن بەهرە خۆڕسکە و هەندێ مرۆڤ لەگەڵ لەدایکبوونەوە خاوەنی بەهرەی خۆیانن، بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە، هەندێ کەس هەن زەین و هزر و مەژییان زیاتر گەرم و گوڕترە لە هی کەسێکی دیکەو زیاتر جووڵە دەکات و خوێنیان تێدا دەگەڕێ بۆیە زیرەکتر بە دیار دەکەوێ و بەهرەمەندتر بە دیار دەکەوێ، پەیوەندی نێوان بەهرە و مەعریفە پەیوەندییێکی لەگەڵ یەک گۆڕینەوەیە واتە لە ئاوی یەکتر دەخۆنەوە، کە بەهرەی زیرەکیت هەبێ و مەژییت جوانتر کاربکات زیاتر سوود لە مەعریفە وەردەگری و دەیخەیتە بەردەستی خۆت، کە خودانی مەعریفەیەکی بەهێزتر بیت زیاتر بەهرەت بەگەڕ دەخەیت. بەڵام ئایا شیعر بە تەنها بەهرە دروستی دەکات؟ نەخێر. هیچ شتێ یا ڕاستتر هیچ ژانرێ ئەوەندەی شیعر سەخت نییە ئەوەی ئەزموونی خۆی بەهێز نەکردبێ نازانێ شیعر چەند زەحمەتە، بەڵام ئەگەر ئەمڕۆ گۆڤار و ڕۆژنامەکان لە جیاتی ئەوەی پاداشتیان بدایە لە بری بڵاوکردنەوە، پارەیان لە خاوەن شیعرەکە وەرگرتبا هیچ کەسێ شیعری وا بە ئاسانی بڵاونەدەکردەوە! چونکە ئەوسا زۆر کەس شیعری بڵاودەکردەوە و پارەی خۆشی دەدا، کەسێکیش ئاوڕێکی لە شیعرەکەی نەدەدایەوە و بە ناچاری دەڵێت با پارەکەی خۆم بە فیڕۆ نەدەم، ئەوکات شیعر هێجگار بەهێز بە دیار دەکەوت و خەڵکی دەیزانی شیعر چەند سەختە.

چونکە لە شیعردا تۆ کەسێک دروست دەکەی کە خۆت تەمەننات دەکرد وا بای، دەتەوێت جوانییێک خەڵق بکەیت سەرنجی ژیان ڕابکێشێ بۆیە ئەزموون جوان و تێر و تەسەل نەبێ شیعرەکە جوان و تێر و تەسەل نابێ ئەمە پەیوەستە بە عەقڵ و

مەعریفە و سۆز و سووتان، پەیوەستە بە دیدگا و بینینی جیهان، پەیوەستە بە بیرکردنەوەی قووڵ و بێ ئەمان .. نەک کەف و کوڵ و سەردوولکە و لالانەوە.

٣

نووسەری تژی عەشق و داهێنان لە چەند ساتێکی کورتدا شتەکانی خۆی دەڵێ و کارەکانی خۆی دەکا و دیالۆگی خۆی بەردەوام پێ دەدا و ئەرکەکانی خۆشی ئەنجام دەدا.. گەورەترین دەقی شیعری لە چرکەساتێ بیرۆکەی خۆی دادەڕێژێ.. ژیان پێویستی بە پێکەنین و قسە و ئەڤینی و نوکتەش هەیە.. نووسین و کاری نووسین عەشقێکە لەگەڵ غەیب، غەیبێکە لەگەڵ نووسەر، ئەوانە سیحر لەگەڵ یەکتر دەگۆڕنەوە.. ئەو سیحرەی بە مانای ژیان لەگەڵ یەکتری لە باخچەی ئەفسووندا.. حەز دەکەم ئەوە بڵێم من لە هەموو وەڵامەکانمدا دەمەوێ خوێنەر بە کێڵە بەفری هەڵڕشتنی مەعریفە خەریک نەکەم، دەمەوێ پێی بڵێم: ژیانی داهێنەر تەحەمولی قسەی پفدراو ناکات.. نووسەر دەبێ وا لە خوێنەر بکات کە توانای ئەوەی هەبێ لەگەڵیا بژیت.. خوێنەر قەرزباری نووسەر نییە، ئێمە قەرزی ڕۆحمان بە نووسین دەدەینەوە و بە وانیش دەڵێین: شایەدبن.

٤

هەموو ئەو گروپ و گروپکارییەی بەر لە ڕاپەڕین هەبوو، کاریگەری خۆیان هەبووە، چونکە ئەو سەردەم نووسەران و نەوەی تازە بایەخیان بە خوێندنەوە دەدا و بازاڕی ئەدەب و ڕۆشەنبیری گەرم بوو، هەروەها ئەدەب و ڕۆشەنبیری ببووە پەنجەرەیەک بۆ ئاشکراکردنی داهێنانەکان لە ڕووی زمان و شێواز و تیمە و فۆرم و ناوەڕۆکەوە، ئیدی گەنجەکان دەپرژانە سەر خۆ بەهێزکردن لەم بابەتانەدا و هەمیشە بە دوای ئەو بەرهەمانە دەچوون کە نەوەی پێش خۆیان بۆ ئەوانی بەرهەم دەهێنا.. بەڵام ئەوەی جێی سەرنج و تێڕامانە ئەوەیە ئێستا کە هەموو شتەکان گۆڕاوە،ئەدەب و ڕۆشەنبیری وەکو جاران بابەتێکی سەرەکی نەوەی تازە نییە و گەلێ داهێنراوی دیکە جێگایانی گرتۆتەوە، بە تایبەتی دەرهاوێشتەکانی جیهانگەرایی کە هێجگار پەرش و بڵاو بوونەتەوە و سەراپای هێزو تواناکانی گەنجانی بەلای خۆیدا پەلکێش



کردووەو لە زۆر جومگەی ئەو دەرهاوێشتانەدا گەنجەکانی دیل کردووەو لە هەندێ شوێندا سڕی کردوون، بۆیە ئەو کاریگەرییەی کە گروپەکانی سەردەمی خۆی هەیانبووە، ئێستا وا نییە، جارێ بایەخدان بە زمان زۆر کەم بۆتەوە، ئەمەو جگە لەوەی نەوەی تازە عەوداڵی زمانی تازەنە و لە هەمان کاتدا عەوداڵی فێربوونی زمانی بیانین، کە پێشتر ئەم دیاردانە کەم بوون، هەروەها گەنجی ئێستا کەمتر بیر لە مەسەلە نەتەوەییەکان دەکاتەوە، کە ئۆباڵی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتی سیاسی کە هیچ کارێکی پەروەردەیی نەتەوەییان لەناو هزری گەنجان نەکردووە تا بایەخ بە بەرهەم و کولتووری سەردەمی خۆیان و نەتەوەکەیان بدەن،، بۆیەش کاریگەری ئێمەش کەم بووە بەسەر نەوەکانی داهاتوو و ئەوانیش لەگەڵمانا دەژین بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو شتانەش تا ئێستا بەرهەمی باش لە هەر بوارێک بێت کاریگەری خۆی هەیە، هەرچەند لە نێوەندێکی کەمیش بێت.

٥

کتێب سەرچاوەی هەموو خەیاڵ و مەعریفەکانە، لە ڕووی دەست نیشانکردن و ناساندن و کەشفکردن، سەرچاوەی هەموو داهێنانەکانە، بۆیە سەفەر بەنێو کتێبەکاندا، سەفەرێکی وەهمییە بەناو دونیای واقیعدا، بۆ من کتێب سەرچاوەی هەموو شتەکانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش سەفەر و گەشتیش ڕۆڵێکی گرینگ دەبینن لە ڕەنگڕێژکردنی ئەو خەیاڵ و مەعریفانەی زەین هەڵیان دەگرێ و کۆمەڵێ ئاسەواری گرینگ لە نێو یادەوەرییەکان جێ دەهێڵن و لە هەمان کاتدا دەبێتە بەشێک لە ئەزموونی نووسەر، تەنانەت ئەدەبێک هەیە ڕەنگە ئەوەی بۆ ڕاست بێت کە پێی بڵێین ئەدەبی سەفەر، یاخود سەفەرنامەکان هەڵبەت پەیوەندییەکی زۆر هەیە لە میانی هزر و چاودا، هزر ئەگەر داینەمۆی هەموو ئەندامەکانی دیکەیە بەڵام بۆ مەسەلەکانی ئەدەب و ڕۆشەنبیری پێویستییان بە یەکتر هەیە، لە بەرداشی کۆتاییدا دەڵێم دوای هەموو ئەو شتانە تازەیی پرۆسێسی بیرکردنەوەی خۆی گەرم نەکات هیچ بەرهەمێک لە دایک نابێت، بە بێ گەرمبوونی زەین هەموو سەفەرەکان بێهوودە دەبن، چاو هەرچەند تیژبین بێ و جوان بەدی بکات پێویستی بەوە هەیە بە فلتەری هزردا بڕوات بۆ ئەوەی بشۆڕێتەوەو ڕەنگڕێژ بن.

هەڵبەت ئەوە تەنها بۆ نووسەران و داهێنەران بایەخێکی هەیە ئەگینا بازرگانی وا هەیە بە هەزاران هەزار سەفەر و گەشت بۆ جوانترین شوێنی دونیا دەکات بەڵام چونکە دیدگای بەسەر ئەدەبەوە ناشکێت هەمووی بە هەدەر دەڕوات.

٦

کتێب:
نەتەوەیێکی خەوتووە و هاواری خوێندنەوەی دەکات، قاسەیەکی پڕ لە گەوهەری ئەڤین و مەعریفەیە،بانگی دەستێ دەکات بیشکێنێ و بازنە جوانەکانی هزری بفڕێنن.
قەڵەم:
تکایە ئەگەر بۆ نووسینی دەقێکی جاویدانی بەکارم دەهێنی گەردنت ئازا بێ ئەگینا دوعا دەکەم تا ئەبەد سەر پەنجەت داغ بێت.
بریا ئەو شەوە ئەی تابا ئاوا بە گوڕ هەڵنەهاتیای چونکە من و ئەوت ئێستاش بە دواماندا دەگەڕێن.

٧

یەک ستایلی لە نووسین جۆرێک لە بێزاری بۆ خوێنەر دروست دەکات، تا ئەو ڕادەیەی ئیدی نایخوێنێتەوە چونکە دەزانی چۆنی دەنووسێ و چی دەنووسێ. فرە ستایلی بۆ نووسەر زۆر باشە، چونکە خۆشی تووشی ئەو حاڵە سەقامگیرییە لە تەمەنێک نایەت ئەم تەک ستایلییە وا لە نووسەر دەکات خۆی لاسایی بەرهەمەکانی پێشووی خۆی بکاتەوە.. هەر بۆیەش لە پەنجا دەقی ئەم جۆرە نووسەرانە یەک وێناکردن هەیە. ستایل تاکە ڕۆژنامەیەکی ئەدەبی پرۆفیشناڵە لە هەولێر، ئایا ئەو تایبەتمەندییە هۆکارێکی گرینگ نابێ بۆ لێک جیاکردنەوەی ئاستی داهێنانی ئەدەبی؟ یان چۆن ئەو تێکەڵاوییە هەڵدەسەنگێنی کە لە ڕۆژنامەکانی ئەورۆدا دەیانخوێنیتەوە؟

٨

هەموو ئەو نووسینانەی کە هەڵگری شوناسی داهێنان و جیهانبینین من چێژیان لێ وەردەگرم، ئەمڕۆکە لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا نووسەرگەلێکی زۆر سەریان



هەڵداوە کە شایستەی ئەوەن بەرهەمەکانیان بخوێندرێتەوە، چونکە بە قووڵاییێکی بڕشت ئامێز و بە پاشخانێکی جوانی مەعریفی و ئێستەتیکایی دەقەکانیان بەرهەم دەهێنن.. مەسەلەی بێزاربوون و بێزارنەبوون پەیوەستە بە ئاستی ئەو دەقەی کە مرۆڤ دەیانخوێنێتەوە، پەیوەستە بە ناوەڕۆکی هیومانیزمی ئەو دەقانەوە کە تا چەند هەڵگری توخمی داهێنانن.. کاتێک کە تۆ مەحوی یا حەمدی یا نالی یا مەولەوی و ئەراگۆن و ئەلیۆت و دانتی و شێرکۆ بێکەس و دڵشاد عەبدوڵلا و بەختیار عەلی و محەمەد موکری و هاشم سەڕاج و ئەوانی دیکە دەخوێنیتەوە دەزانی ئەوانە خودانی ئەزموونی خۆیانن لە هەوەنتە و بێ بنەمایی دەقەکانیان فڕێ نادەنە مەیدانەوە بۆیە چێژیان لێ وەردەگریت و لە بێزاری بە دوورن، بەڵام کاتێ بە پێچەوانەی ئەوانەوە دەق دەبینی، ئەوا دەکەویتە ناو بێزاری و چێژکوژییەوە.

٩

هەروەک دەڵێن کتێب حیکمەتی بوونی جیهانە، کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بێ بوونی کتێب کۆمەڵگاییێکی نەزانە، کۆمەڵگاییێکە هزری بەتاڵە، توانای بەرهەمهێنانی مەعریفی نابێت، بۆیە دەبێ کتێب ئەلتەرناتیڤی هەموو شتەکان بێت، ئێمە لەناو کتێب فێری خۆمان دەبین و شوناسی دەوروبەر کەشف دەکەین و ئاستەکانی فیکری و مەعریفی شارەزا دەبین، بۆیە دەبێ کتێب کۆڵەکەی سەرەکی تەلارەکانی بیرکردنەوەمان بێت، هەندێ جار هۆکاری ئابووری گرینگە بۆ وەلاتانی کتێب بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتدا، بەڵام ئەم پێوەرە لە ڕۆژاوا کاری پێ ناکرێت، بە پێچەوانەوە بەهێزبوونی باری ئابووری دەبێتە هۆی سەقامگیربوونی کتێب و زۆربوونی خوێنەران، بەداخەوە لە کوردستان دوای ڕاپەڕین خوێنەر کەم بووە، هۆیەکەشی ئەوەیە کە هێرشی جیهانگەرایی زۆر بە خێرایی لە کوردستان پەرەی سەندووە و شتێکی تازەشە لە کوردستان کە زۆربەی ئامێرەکانی دەرهاوێشتەی ئەو هێرشەن جێگەی کتێبیان گرتۆتەوە بە تایبەت لای گەنجەکان، لە ساڵانی بەر لە ڕاپەڕین کتێب هێزێکی گرینگی هەبوو، خەڵکانێکی هێجگار زۆر خەریکی خوێندنەوە بوون، تەنانەت کتێب تاکە سەلوای مرۆڤی کورد بوو لە ژێردەستایەتی دوژمناندا.

هەندێ جاریش ئاست نزمی کتێب ئەو پەرچەکردارە دەخولقێنێ، لەگەڵ ئەمەشدا

هێشتاکەش کتێبی کوردی لە وەزعێکی مامناوەندی دایە، کتێبی باش خوێنەری باشی هەیە.

١٠

نەبوونی ڕەخنەیەکی بەهێز و فرە چەمک لە نێو ئەدەبی کوردیدا ڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئازادییەکی ڕاستەقینە و فرە مانا، لە هەر وڵاتێک ئازادی بە مانا مرۆیی و ڕاستەقینەکە هەبێت، لەو وڵاتەدا ڕەخنە بەهێز دەبێ و دەبێتە سەرچاوەیێکی گرینگی مەعریفی و دەبێتە هۆکارێکی گرینگی سەرهەڵدانی پرۆژەی گەورە گەورەی مەعریفی و دەزگای بەرهەمهێنەری مەعریفی، لەنێو ئەدەبی کوردیدا هێشتاکە ڕەخنە و ڕەخنەکاریش لە خودی خۆیان ئازاد نین و دیلی دەستی کۆمەڵێک قەوانی سواوو داب و نەرێتی سەلەفین، ئەمەش وای کردووە، بەرهەمی ڕەخنەیی لە ئاستێکی نزمدا سەقامگیر بێت و نەتوانێ لەناو بەرهەمی ئەدەبیدا دەقی ئەدەبی جوان بخولقێنێ، ئەگەرچی هەندێ تەوژمی تازە هەن لەنێو گەنجەکاندا بەڵام ئەویش جیدییەتی بەردەوامبوونی کەمە، باشترین ڕێگەچارە بۆ سەرهەڵدانی ڕەخنەیێکی گەورە ئەوەیە دەور و خولی بەرهەمی گەورە بدەن و حسێب بۆ پەیوەندییەکان نەکەن و بە ڕۆحێکی ئازاد و ڕەها سەیری بەرهەمەکان بکەن.

١١

من ناتوانم بڵێم کولتووری کوردی کولتوورێکی مەرگدۆستە، چونکە کولتوور لەسەر بنەمای مەرگدۆستی دانامەزرێ، بەڵکو ئەوە ژیاندۆستییە وا دەکات کولتوور بێتە کایەوە و میللەتان بڕەخسێنێ، بەڵام دیاردەی زیندووکردنەوەی دوای مردن لە نێو ئەدەبی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوویێکی دوور، ئەو ڕابردوویەی کە کۆمەڵێک ئەدیب و شاعیرانی بەرهەم هێنا و ئیدی تا قۆناغێکی زۆر درەنگ ئەدیب و شاعیر سەریان هەڵنەدایەوە، ناچار بۆ ماوەیەکی هێجگار زۆر ئێمە هەر خەریکی قسەکردن بووین لەسەر ئەو نەوەیە، چونکە بار و گوزەرانی خەڵکی کوردستان لە نزمترین ئاستی خۆیدا بوو لەبەر دەستی داگیرکەراندا، بەڵام دوای ئەوەی ئیدی قۆناغی سەرهەڵدانی ئەدەب گەیشت ئەم دیاردەیە کەمتر بۆوە، بەڵام نابێ ئەوەش فەرامۆش



بکەین کە دەبێ یادی ئەدیب بکرێتەوە و دوای مەرگیان فەرامۆش نەکرێ، بەڵام نەک بە شێوەی شێوەن و سەردوولکە، بەڵکو بە شێوەی بەرهەمهێنانی مەعریفی سەبارەت بە بەرهەمەکانیان، بە مانای کەشفکردنی ڕەهەندەکانی ناو دەقەکانیان.

١٢

لە ڕاستیدا ئەم شیعرە باس لە هیچ یەک لە برادەرەکان ناکات وەک دەستنیشان کردن، بەڵکو باس لە زەمەنی تاعون دەکات، زەمەنی داخۆران و هەڵوەرین، زەمەنی نەناسینەوەی گەوهەرەکان و دارمانی بەها مرۆییەکان، ئەلەوێدا مەرگ سەرداری هەموو ئەو کولیرایایەیە کە وردە وردە گیانی کۆمەڵ دەخاتە بەر مەترسی ڕەشەبا، ڕەشەبایێک ئیدی هێزی ڕاگرتنیمان نامێنێ و هەموومان وەک گەڵادار پەرش و بڵاو دەکاتەوەو فڕێمان دەداتە سەر سنوورەکان و یەکتر ناناسینەوە، ئەو خاکەمان لەبیر دەباتەوە کە هەزاران ساڵە نەوە بە نەوە وەک نوشتوێکی موقەددەس دەیپارێزێ و ناومانەتە سەر دڵمانەوە، سەرچەلەی شیعرەکە بۆ ئەوە ڕستەڕێژ کراوە یەکسەر بەرەو ئەو ئاژیرەت ببات کە لە کەللە بدا و ئاگاهی بخولقێنێ، شیعرەکە لە ڕێگەی تراژیدڕێژییەوە وێنای بەختەوەرییەکان دەکات، لە ڕێگەی مەرگەوە باس لە هەستانەوە و دروستبوونی جوانی دەکات، لەم شیعرەدا ئێستەتیکا بەندە بە قووڵکردنەوەی چەمکی کارەساتەکان نەک وەدەرخستنی ڕووکارە جوانەکان.

١٣

ئەو کارەی من لە ئێستێکەدا خۆی نانوێنێ، بەڵام دوای زەمەنێک دەبێتە جێگەی مشتومڕێکی زۆر، دوای ئەوەی ناوەڕۆکی ئەم کتێبە لەنێو ئەدەبی کوردیدا ئاشکرا دەبێ، ئەو کتێبە تا ئازاد بێت پێویستی بەو زەمەنە هەیە کە ترسی سەلەفییەت لە ئارادا نەمابێ، ئێستاش لای ئەوانەی لە کۆت و پێوەندی سەلەفییەت و ترسی تیرۆر ڕزگاریان بووە جێی خۆی هەیە، چونکە هیچ کتێبێکی دیکە ئەوەندەی ئەو کتێبەی من کردوومەتە کوردی لە ئەدەبی جیهانی گفتوگۆی لەسەر نەکراوە و گرفتی نەناوەتەوە، تەنانەت ئەم کتێبە سەرچاوەی کتێبی[کۆدی داڤینشی]یە.

١٤

ئەگەر کاتی ئاوا هات ئەوسا پێت دەڵێم چی دەنووسم؟
بەڵام وەک پێشەکی ئەمەت بۆ دەنووسم:
[لای وایە کە ژین فانی نییە و ڕێگەیی دوورە
نایزانێ کە هەر پەنجەیێ لەم خاکی زەمینە
کوڵمی دە هەزار " لەیل " و دەمی سەد " مەم و زین "ە]

١٥

من لە چاوپێکەوتنێکی دیکەش باسم لەوە کردووە کە دەبێ ئەدەب بەگشتی و شیعر بەتایبەتی ئەو بابەتانە ڕزگار بکەن کە فەلسەفە و مەعریفە قۆرخیان کردووە. دونیای ئەدەب و شیعر باخێکە و فەلسەفە و مەعریفەش باخێکی دیکە، گوڵەکانیان جیان هەریەکەو بۆنێکی خۆی هەیە. ئەدەب و فەلسەفە پەیوەستە بەهاوارەکانی ڕۆحی مرۆڤ پەیوەستە بەوەڵامدانەوەی ئەو ئاگر و تەنوورانەی لەناو خوێنی مرۆڤدا هاواری ڕەهایی دەکەن، قسەیە لە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤ. لە ڕۆحەوە بۆ ڕۆح، بەڵام مەعریفە و فەلسەفە دیالۆگی نێوان پرسیارەکانی مرۆڤ و کەڕی ئەم کەونە بێ کۆتاییيە، قسەکردنە لەگەڵ ئەو هێزە نادیارەی لەوەتەی مرۆڤ هەیە پرسیاریان لێ دەکات و بەڵام بێهوودە لەناو بێ وەڵامیدا سامگرتوو بووە. بەڵام شیعر گەورەترین و جوانترین و پڕ ئومێدترین سەلوای مرۆڤە وەک چۆن ئاگر لەنێو لەرینەوە جوانەکانی خۆی گەرم و گوڕیمان پێ دەبەخشێ ئەدەب و شیعریش ئاوەها ئومێدمان پێ دەبەخشێ ناهێڵێ لەناو ڕاڕەوەکانی فەلسەفەدا نائومێدی بمانکوژێ، هەموو ئەوانە ڕاست دەکاتەوە و گیانیان وەبەر دەدا کە لەناو باخەکانی فەلسەفەدا بە حەشیشی پرسیار کەوتوون هێزو بڕستی مانەوەیان پێ نەماوە... ئەدەب و شیعر دێن بەلاواندنەوەی گەشەبەخش و مرۆڤ دۆستی و ژیان دۆستی پاکیان دەکاتەوە لە ژەنگ و ژارەکانی ئەو پرسیارە هەزاران هەزار ساڵییەی کە فەلسەفە بەرهەمی هێناون .

بەکورتی فەلسەفە بەرهەهێنەری گومانێکی جاویدانەیە کە ساڵەهایە بەدوای یەقین دەگەڕێ کە هەرگیز لە بەرامبەر هێزە شاراوەکانی ئەم کەونە کوتاییيان نایەت،



ئەدەب و شیعر ئەلتەرناتیفی ژیانێکی پڕ لە سەرکێشی و ڕۆحییە، کار لەناو پێداویستییەکانی ڕۆح و سووتان و ئەڤین و گەڕان بەدوای یوتیپێکی سەوز دەکات کە لایەنی کەم زیندەگی لەبەردەم ئایندەی مرۆڤایەتی خۆشتر بکات، ژیان لەلای بەنی بەشەر خۆشتر بکات لەو وادانەی کە ڕاڤیارانی فەلسەفە بۆ مرۆڤ دەڵێنەوە.

شیعر پێمان ناڵێ ئێمە چین بۆچی هاتووین و بۆ دەڕۆین... بەڵکو پێمان دەڵێ ئێمە هەین و هەمیشە دێین لەناو باخەکانی جوانیدا پیاسە دەکەین. ئەمە سیمای بیرکردنەوەی منە لە سەرتاسەری ئەم کتێبی (ئەدەب و فەلسەفە)، هەر بۆیەش بابەتەکانی ناو ئەم کتێبەم پۆلین کردووە لەنێوان ئەدەب و فەلسەفە.

١٦

دیوانی ( خاک و هەڵۆ) یەکەم ئەزموونی خۆشەویستی منە، هەموو شیعرەکانی لەو چرکانەدا نووسراون کە نەتەوەکەم لەژێر تەپ و تۆزی هێزی بێ ڕەحمیدا غەرق بوو بوو. بۆیە هەر پارچەیەک لەو شیعرانە وەرگریت لەنێو نائومێدییەکی گەورەدا غەرق بووە، نا ئومێدییەک لەوەدا سەری هەڵداوە کە ڕۆحی نەتەوە بە پۆلای داگیرکەران گەمارۆ دراوەو مەودای یەک تاکە جریوەی نەماوە. من گوزارشت لەو بێدەنگییە مێژووییيە دەکەم کە نەتەوەکەمی نوقمی ونبوون کردووە... باس لەو هاوارە دەکەم کە لە سەدەکانی زۆر دوورەوە دەگاتە گوێم و هیچ وەڵامێکمان بۆ نییە، باس لە کوشتنی جوانی دەکەم. باس لە مەرگی مرۆڤ دەکەم، بەڵام نەهاتووم دروشم داڕێژم... بەڵکو شیعرم داڕشتووە و لەژێر پەردەی ئێستەتیک تانوپۆم پێ داوە، من پێموایە دروشم لە شیعردا چ جیاوازییەکی لەگەڵ خودی داگیرکەر نییە. هەر ئەو دروشمە و دروشمکارییە بوو ساڵانێکی دوورودرێژ ئەدەب و شیعری کوردی کوشت و تووڕی هەڵدانە ناو مەرگ، خەباتکردن لەپێناو داهێنانی پوختی شیعری سەختە وەکو خەبات لەپێناو ڕزگاربوون... ڕزگارکردنی شیعر لە پۆخڵی. ڕزگارکردنی نەتەوەیە نابێ بە کەمبایەخی وەرگرین، من لە دیوانی خاک و هەڵۆدا وام کردووە، هەڵبەت ئەزموونی سەرەتاییيە ناڵێم کامڵە، بەڵام بۆ ئەو سەردەم کە هەمووی دروشم بوو من توانیم ئەو دروشمانە بەدوور خەمەوە لە خۆم.

١٧

شیعر خۆی جۆرێک لە سۆفێگەرێتی هەڵدەگرێ و تاڕادەیەکی باش سۆفیگەرێتی شوناسێکی سۆفیزمی هەیە بەو مانایەی کە گێرمەو کێشەیەک هەیە لەنێو ڕۆحی مرۆڤدا کە باسی کەشفکردنی نهێنییەکان دەکات، بەڵام بەدیدگایەکی جوانئامێز، ئێمە نابێ کە باس لە جوانی دەکەین پێمان وابی جوانی هەر لە ئافرەت و سروشت هەیە، جوانییەکان هێجگار زۆرن، هەندێکیان خۆیان لەناو دەریاکان حەشارداوە، هەندێکیان لەنێو گاشە بەردەکان و هەندێک لەناو ددانەکانی فیل و هەندێکیش لەناو دڵۆپەکانی مەی... من لە دیوانی (سیفری ئاگردا) کەوتوومەتە داوی ئەڤینێکی پرسیارکار و وەژدێکی بێ کۆتایی سەبارەت بە شتە نادیارەکان جا مامەڵەکردن بێ لەگەڵ ئەو هێزەی فەلسەفە بەدوای دادەگەڕێ یا مامەڵەکردن بێ لەگەڵ غەیب، دەکرێ ئەو هێزە بخەیتە ناو شیعر و دەسەڵاتەکانیان لێ بسەنیتەوە و بیکەیت بەدەسەڵاتی شیعری خۆت، شیعر دەتوانێ هەڵگری گەورەترین کاری کەشف بێ، بەڵام لەنێو ڕۆحێکی ئەشقامێزدا، حەللاج هەوڵی داوە دەسەڵات لەو هێزە بسەنێتەوەو بیداتە بەر شیعر، کە جوانی لێ بتکێتەوە، هەرواش سۆفیستەکان... مەولانا جەلالەدین ڕۆحی بەرۆحێکی پڕ لە تەسەوفەوە جوانترین شیعری بۆ دەسەڵاتی مەعریفی شەمس تەبریزی نووسیوە و هەموو زانست و مەعریفەکانی ئەو مرۆڤەی کەشف کردووەو لە شیعری ( بشنوازنی چون حیکایت می کند) دایڕشتووە، ئەم شیعرەی بە عیشقی شەمس نووسیوە بەفیراقی خۆی شەتەک داوە، کەواتە جوانی لە پیاوێکی پیری شەست ساڵیش هەیە وەک چۆن مەولانا نووسیویەتی بۆیە سۆفیگەرێتی پانتاییەکی زۆر لە شیعر بەو کۆنسێپتە داگیر دەکات... زۆربەی سۆفییەکان شەهیدی عەشقن و گەمەیان لەنێو ڕۆح و ئاگردا کردووە، گەمەیان لەنێو هێز لێ سەندنەوەی دەسەڵات کردووە تا دەسەڵاتی شیعر دروست بکەن.

١٨

من لەم دوو ساڵەی دواییدا بیرم لەوە کردەوە کە ڕابردووەکانم گەوهەرێکی زۆر ڕەنگاوڕەنگیان تێدایە بەداخەوە هەموویان لەناو قوڕو لیتاوی ڕۆژگار ون بووین



هەندێ لەو گەوهەرە شکاوانە هەتا ئەگەر پارچە پارچەش بوون بریسکەیان لەبەر تریفەی مانگە شەوی شیعردا جوانتر دەڕوات، بەڕاستی بۆم دەرکەوتووە کە شیعرانێکی زۆرو جوان خۆیان لەناو ئەم گەوهەرانەدا شاردۆتەوەو هاواری ڕەهایی و ڕزگارکردنیان دەکەن، بۆیە هەموو ئەو ڕابردووانەم لە زەینی خۆمدا تێپەڕاند بۆ ئەوەی پێیانەوە بەرەو ئایندە بچم، شیعر ڕیسە گیایێکی ئێجگار غەریبە لەناو تاشە و تاوێردا شین دەبێ و سەر هەڵدەدا، ئێمە ڕۆژانە بەسەر زۆر کەرەستەی شیعری نایابدا گوزەر دەکەین بێ ئەوەی هەستیان پێ بکەین ئاوڕیان لێ نادەینەوە... من لەم دواییەدا هەوڵم داوە تازەترین شیعریان بۆ بنووسم کە کەرەستەکە هی ڕابردوو بێ، واتە گەوهەرە شکاوەکان، بەڵام بیرۆکەی داڕشتن و دەربڕینیان تازەو هاوچەرخ بێت هەر لەم ڕووەوە شیعری (بریقەی زیوێک و زیوی شکاو)- و گەلی شیعری دیکەم نووسیون، گەڕانەوە بۆ ڕابردوو دەقی جوانی بەرهەم هێناوە، هەموو بیرۆکە تازەکان لەنێو ڕەحمی ئەم ڕابردووانەوە جێماون و ڕەنگرێژ کراون لە نێو شیعر.

شیعر تاکە ژانرێکە کە (عمی الازمان) هەیە، لای دەقی شیعر لەساتی هەڵڕژاندا جیاوازییەک لەنێوان ڕابردوو و ئایندە نییە، گرنگ ئەوەیە چۆن بۆی دەچێ، بەتایبەت لەلای میللەتانی ڕۆژهەڵاتی هێشتاکەش ڕابردوو ئەتراکتیفی خۆی لەدەست نەداوە، ئەوەش بەو مانایە نایەت کە باوەڕمان بە ڕابردووژینی هەبێ، لە شیعردا ئەمە مەسەلەیەکی جیاوازە، چونکە کارکردن لەناو جوانییەکان، کارکردنە لەناو هەستەوەرییەکان، من باوەڕم وایە تا ئەزموونی شیعر بە ساڵدا دەچێ و دیدگای شاعیر فراوانتر دەبێ ڕابردوو دەبێتە ئایندە و هەندێ جاریش ئایندە دەبێتە ڕابردوویەکی جاویدانی.

١٩

عەرەب بەگشتی و ڕۆشنبیرەکانیان تووشی جۆرێک لە نیگەرانی ئەبەدی هاتوون لەڕووی ژیان لەسەر زەوی یا گەڕانەوە بۆ ئاسمان، لەبەر ئەوەی ئەوان پەیوەستن بەکتێبی پیرۆز و پێیان وایە ئاسمان هی ئەوانە، بۆیە ئەگەر کەسێ بەپێچەوانەی ئەم بیرۆکەیە کاربکات چ لە مەودای شیعر بێت چ لە مەودای لێکۆڵینەوەو ڕەخنە بێت دژایەتی دەکرێت، هەندێ جار هەوڵی (ألغا) کردنی دەدەن، ئەمە وای کردووە هەتا

گەورە ڕۆشنبیرەکانیشیان لەنێو ڕەوتێکی شۆڤینیستیدا گەمە بکەن، عەرەب ڕۆشنبیری گەورەیان هەیە، بەڵام هەر هەموویان لە پشتی ڕژێنی سنەوبەریان هەڵگری جۆرێک لەتەک بابەتین و باوەڕیان بەجیاوازی و فۆرمەکانی جیاوازی نییە، هەر بۆیەش کەسێکی وەکو ئەدۆنیس کە دێت ئەم کلتوورەی بیرکردنەوەیە لەڕێگەی شیعر یا تەنزیرات دەشکێنی دژایەتی دەکرێت... ئەم بۆچوونەی من تەواو ڕاستە ئەگەر بۆ نموونە (سادق جەلال) بخوێنیتەوە سەبارەت بە ئەدۆنیس هەروەها زۆربەی نووسینەکانی گەورە ڕۆشنبیرانی عەرەب دژ بە بۆچوونەکانی ئەدۆنیسن بێ ئەوەی باسی بکەن، هەرچییەک بکەن ناتوانن لە ناوەرۆکی کلتووری خۆیان ڕزگاربن، ناوەرۆکی کلتوورەکەیان و هێزی کاریگەرێتی کلتوورەکەیان بەهێزترە لە هێزی بیرکردنەوەیان– ئەدۆنیس لە (ثابت ومتحول)دا بەوردی ئەم شتانە باس دەکات.

د. ناسر حامد ئەبوزێد و محەمەد عابد جابیری نووسەرانێکی گەورەن باس لە ئەقلانییەت و مەعریفە دەکەن، باسی شتی گرنگ دەکەن بەڵام کە دەگەنە سنووری کلتوورەکەی خۆی هێزی پەڕینەوەو ڕەتدانی ئەو سنوورەیان لەبەردەبڕێ.

محەمەد بەنیس یەکێ لە شاعیرە گەورەکانی ڕۆژئاوای عەرەبە سەرەڕای ڕۆشنبیرێکی زۆری کە لەژێر کاریگەرێتی زمانی فەرەنسی دایە، ئەویش... زاتی ئەوە ناکات لە کلتووری تەک ڕەهەندی خۆیدا ڕزگاری بێ و ئەوەی باوەڕی پێیەتی لەپاتنی خۆیدا ئەوە بڵێ.

لەڕاستیدا ئەدۆنیس ڕابەری هەڵتەکاندنی ئارکیولۆژییە لەنێو کلتووری عەرەبیدا باوەڕێکی بەتینی بەئازادی مرۆڤ و جیاوازخوازی هەیە، بەڵام هەمدیس پابەندی پیرۆزیی کلتووری خۆیان کە ڕازی بین یا ڕازی نەبین ئەم کلتوورە هەڵگری ئەوپەڕی توندوتیژییە، بەکورتی سنوورێک لەبەردەم ڕۆشنبیری عەرەب هەیە مەحاڵە بتوانن بیپەڕێنن، شتەکانیش دیارن لە ڕەنگدانەوەیان لە گوتاری سیاسی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیدا.

٢٠

خۆرئاوا هەوڵ دەدات لە ڕێگەی بەرهەمهێنانی مەعریفی و تەکنیکیدا وەک سێنترالێک خۆی سەقامگیر بکات و ڕۆژهەڵات بخاتە پەراوێزی خۆیەوە، ئەوەشیان



لە ڕێگەی بەهێزکردنی ئابووری خۆی دەبێت و لە ڕێگەی کۆنترۆڵکردنی سەرچاوە ئابوورییەکانەوەیە کە هەوڵ دەدات هەموو شوێنێکی ئەم سەرزەمینە بکاتە بازاڕی ئازادی خۆی، خۆرئاوا لەژێر هەر چەترێکدا دەسەلاتی خۆیان داڕێژن هەڵگری جۆرێک لە لیبرالیەتێکی پرەگماتیکین، دەیانەوێ هەم ئازادیی بازاڕ و هەم ئازادیی هەڵسووڕانی جیهان بەدەست بهێنن، ئەمەیە کە جیهانگیری بەرهەم دەهێنێ، ڕۆژهەڵات پایەندی کلتووری خۆیەتی بەڵام نەیتوانیوە بەرهەمهێنەری تەکنیکی بێ، تاوەکو ئێستاش لەنێو مەعریفەی ڕەوحانی خۆی دەژێت، دڵ کاریگەرترە لە ئەقڵ، نوشتە بەهێزترە لە نەشتەگەریی هەربۆیەش خۆرئاوا هەمیشە بالادەستە، چونکە بەخەیاڵی سەرزەمین دەژیت لەکاتێکا ڕۆژهەڵات بەخەیاڵی یۆتۆپێکی غەیبی دەژیت، ئەوان هەمیشە لە ئێستادا دەژین و لەناو ئێستادا کاردەکەن ئاوڕ بۆ دواوە نادەنەوەو باوەڕیان بە پاڵەوان نییە، ئەمەش وای کردووە ڕۆژئاوا دوورکەوێتەوە لە ئەفسانەو بێ سیمبۆل بژیت سیمبۆلدۆستی لای ئەوان کۆتایی هاتووەو ئێستاژینی گرنگە لەلای ئەوان، بەڵام ڕۆژهەڵات وانییە پابەندی هەزار سمبۆل و پیرۆزییە کە وای کردووە ئەقڵ لەنێو سوباتێکی ئەفسانە ژینی درێژخایەندا بژی و بواری بەرهەمهێنانی لەبەر ببڕێت، جیهانگیری پڕیەتی لە شتی جوان، بەڵام بۆ ئەو نەتەوانەی کە نازانن پێشوازی لێ بکەن و نازانن چۆنی بەکاربهێنن دەبێتە شمشێرێکی دوو تیغە تیغێکیان ئەوەیە ئەگەر ئەو نەتەوانە بەتایبەت نەتەوە پەراوێزکراوەکان و نەتەوە پەرش و بڵاوەکان کە نازانن بەکاری بهێنن بەزووترین کات جیهانگیری هێندەی دیکە پەراوێزیان دەکا و لە بەرداشی کۆتایی لەناویان دەبات، تیغەکەی دیکەش بۆ ئەوانەی پێشوازییەکی زانستییانەی لێ دەکەن بەرهەمهێنەری بەختەوەرییە. هەمیشە بەدرێژایی مێژوو بەختەوەرییەکان دێن، بەڵام نەزانەکان وردوخاشی دەکەن.

٢١

هیرمان هیسە، یەکێکە لە شاکار نووسەکانی ئەدەبی ئەڵمانی لەم بارەوە بەشدارییەکی ئێجگار فراوانی هەیە و ڕۆمانی (لعبة الكريات الزجاجية) گەورەترین شاکاری ئەو ڕۆماننووسەیە کە لە هەمان ئەو ڕۆمانەشدا بەدوای ئاوی حەیاتدا

دەگەڕێ، هێرمان هەڵگری جۆرێکی تایبەتی سۆفێگەریتییە بەتایبەت لە ڕۆمانی سیزارتا، سەرچاوەی نووسینەکانی هێرمان هیس لەنێو ستوونەکانی بودایی و مەسیحییەت و ڕۆژهەڵاتە، ڕۆمانی سەفەرێ بۆ ڕۆژهەڵات هەوڵی باندێکە لە چەند کەسێک کە نیازی ڕۆژهەڵات هەریەکەی بەئامانجێکەوە شەتەک داوە و ڕێی خۆیان دەگرنە بەر بەرەو ئەو کانی شەوقەی کە ئەوان پێیان وایە لە ڕۆژهەڵاتدا دەیدۆزنەوە، ڕۆمانەکە بەشێوەیەکی سیحرامێز ڕەنگرێژی کاری پاڵەوانی خۆی دەکا، زیاتر حەزی هیرمان هیسەو بۆ ئەڤینی ڕۆژهەڵات و فاتیمەی ڕۆژهەڵاتی لەشێوەی حەج کردنێکە بەڵام لەناو تەکنیکێکی ئەندازەیی بەهێزدا، سەرەداوەکانی تانوپۆی ئەم ڕۆمانە زوو زوو ون دەبن و دەدۆزرێنەوە... لە ڕاستیدا من بەعەشقی ئەوەوە ئەم ڕۆمانەم وەرگێڕاوە، کە بزانن نووسەرانی دونیا زۆرن بە ئومێدی ئەوەن کە ڕووەو سەرچاوەکانی ڕۆژهەڵات بەرێکەون و بابەتی نووسینەکانی خۆیان بدۆزنەوە و بەشاکار دەرببرن...

لە ڕاستیدا هیرمان هیسە لەزۆربەی ڕۆمانەکانی بەدوای ئەو (کاستالیایە)دا دەگەڕێ کە لە ڕۆمانی گەمەی کەلا شووشەکاندا باسی دەکات، لەوێ کاستالیایە لە سەفەری ڕۆژهەڵات فاتیمەی ڕۆژهەڵاتە و لە سیدهارتا ڕەنگرێژکردنێکی بوداییەو ئاواش باقی لە ڕۆمانەکانی تریدا، ئەو ڕۆمانەی من وەرمگێڕاوە ڕۆمانێکی زۆر گرینگە بەداخەوە کەمی لێ چاپکرا و زۆربەی خوێنەران نەیاندیوە، بەڵام تەمام وایە کە لەهاتوویێکی نزیکدا چاپی دووەمی بکەمەوە.

## ٢٢

کاتی خۆی کە لە ئاوارەیمدا لە وڵاتی ئێران ئەم کتێبەم دەستکەوت (ڕەگەکان) و خوێندمەوە تام و چێژێکی زۆرم لێ وەرگرت و بڕیارم دا بیکەم بەکوردی، هۆیەکەشی ئەوەبوو، لەزۆربەی شوێنی ئەم ڕۆمانەدا نەتەوەکەی خۆم بەبیر دەهاتەوە کە چۆن ڕادەگوێزران و لە مەفتەنی خۆیان بەدووریان دەخستەوە، چۆن ماڵوێران دەکران بەدەردی ئەنفال دەچوون، لە وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانەدا زۆرجار گریاوم... فرمێسکێکی زۆرم لەگەڵدا هەڵڕژتووە، ئەلکسی هیللی بەڕەچەڵەک ئەفریقی و کاتی خۆی باو و باپیرانی ئەویان لەگەڵ هەزاران ئەفریقی دیکە ڕفاندووە بۆ مەزراکانی



ئەوبەری دەریا گەورەکانیان بردوون و بێ ڕەحمانە کاریان پێ کردوون و مومارەسەی هەموو جۆرە تاوانێکیان لەگەڵدا کردوون بەتایبەتی کاری جنسی، ئەمانەیان بەپاپۆڕ بەچەندین شەووڕۆژ بەبێ خواردن و نووستن و حەسانەوە گواستۆتەوە، تەنها تراژیدیای گواستنەوەیان بۆ وڵاتەکانی خۆیان مایەی هەزارەها ڕۆمانە ئەوەی بەسەر ئەوانەوە هاتووە مەگەر بەسەر کورد داهاتبێ لە کارەساتی ئەنفالدا، بەڵێ، ئەم نووسەرە هەستاوە بە واقیعی، مێژووی میللەتەکەی خۆی گێڕاوەتەوەو بەهەزاران هەزار بەڵگە و دیکومێنتی کۆکردۆتەوە لەنێو ڕەفەکانی کتێبخانەی جیهانییەکان تا بیانخاتە سەر کاغەز و ڕەگ و ڕەچەڵەکی خۆی بدۆزێتەوە. تا ئەم کتێبە نەخوێنیتەوە نازانی ئەو خەڵکە ڕەشەی ئەفریقیا چییان بەسەرهاتووە لەدەست زوڵم و زۆرداری سپییەکان، هەر ئەوەشە وای کردووە کە ئەم ڕۆمانە بکرێ بەفیلم و بەدرێژایی چەندین ساڵ لە شاشەکان نیشان بدرێ، منیش بۆ ئەوەی نەوەکانی داهاتوومان هێندەی دیکە پەیوەست بن بە نەتەوەکەی خۆیان و مێژووی نەتەوەکەیان، ئەوەم وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی کە نوسخە کوردییەکەی لەهەردوو نوسخەی فارسی و عەرەبییەکە تەواوتر و کامڵترە، چونکە زۆر شتیان لێ فڕێدابوو من لە ئینگلیزییەکە وەرمگرتۆتەوە. ڕۆمانەکە بە ڕفاندنی کونتاکنیتەوە دەست پێ دەکات و باس لە هەوڵی ڕاکردنی دووبارەی کونتاکنیتە بۆ وڵاتی خۆی دەکات کە تا دوا هێزو بڕستی دەستبەرداری ڕاکردن نەبوو بەرەو وڵاتەکەی خۆی، بەڵام بەداخەوە مردو نەیتوانی جارێکی دیکە بە وڵاتی شادبێت.

## ٢٣

دیوانی (پیانۆی ڕۆژهەڵات) بە کتێبی تاقانەی ڕۆژهەڵاتی دەزانم نەک لەڕووی پیاهەڵدانەوە بەڵکو لەڕووی هەڵبژاردنی بابەتی شیعرەکانی ناو ئەم دیوانەوە، زۆربەی شیعرەکانی ئەم دیوانە– تەئەمولین– واتە ڕامان ئامێزن، شاعیر لەم دیوانەدا لەژێر کاریگەریتی سروشتەکانی وەحیدا کاردەکات و دوور دوور دەڕوانێ، هەوڵ دەدا ئەوەی کە خەونی پێوە دەبینێ لە شیعردا ساغی بکاتەوەو داخی بۆ هەڵبکێشێ. شیعر لەم دیوانە ڕوخساری ژێر تەپوتۆزی ڕۆژگارو غوربەتی شاعیر دەنوێنێ و نمایشی حاڵەتەکانی گریانی ناخەوەی شاعیر دەکات، هەموو شیعرەکانی ئەم دیوانە

بەکەرەستەی ڕۆح نووسراون، بەو مانایەی کە لەسەر زەمین دوورکەوتۆتەوە لە حاڵەتی فریندایە، لەوەدایە کە ئایا مرۆڤ چۆن لەسەر زەوییەک هەڵدەکات کە هەموو حەسانەوەیەکی ڕۆحی تێدا مەحاڵە... شیعر وەڵامی ئەم پرسیار لەخۆی دەکا، بەدوای یوتیپەکاندا دەگەڕێ، بەڵام بەداخەوە هەرگیز تیشکێ لە وەڵامی پێ نادۆزرێتەوە بۆیە هەمیشە لە حاڵەتی سووڕانەوەدایە.

٢٤

ئەمانە کۆمەڵێک بابەتی شەڕانگێزین لە شیعر، کۆمەڵێک بابەتی پڕ لەمەترسین بۆ شاعیر، وەکو ئەو ماسییەی پێمان وایە نزیکە لە پێستی سەرەوەی ئاو بۆیە دەستی بۆ دەبەین بیگرین... بەڵام بۆمان دەردەکەوێ کە زۆر دوورەو دەخزێینە ناو ئاوەکە و تەڕ دەبین و هیچمان بۆ دەستگیر نابێ. شیعر هەوڵدان نییە بۆ دۆزینەوەی ئەم بابەتانە بەقەرد ئەوەی بەدیهێنانی غایەتە پەنهان کە خودی شاعیریش نازانی ئەو غایاتە چییە ئاوا ڕۆحی شاعیر هەراسان دەکات و دەیانخاتە گێژاوی ترین، هەمان ئەو غایەتە کە شاعیر تووشی کەڵکەڵەی گەڕان و سووڕان دەکات بۆ کەشفکردنی ماهیەتی ئەو غایەتە شاعیری ڕاستەقینە بەو پرسیارانە قەڵس دەبێت کە سەدەیەکە دەیانەوێ شاعیر بخەنە بەر مەحەکی درکاندنی سەرچاوەکانی شیعر، شیعر خاوەنی هیچ سەرچاوەیەک نییە، ئاو لە هیچ سەرچاوەیەک ناخواتەوە، ڕۆحی شڵەژاوی شاعیر نەبێت کە خۆشی نازانێت ئەم شڵەژاوییە چ قەدەرێک دروستی کردووە، بەڵکو هەمیشەو بۆ ئەبەد لەناو نادیارییەکی کوشندە دەسووڕێتەوە کە شاعیری گەورە پێی وایە ئەگەر لەناو ئەو نادیاری و مەجهولییەتە دەریکێشی ئەوە زیندە بەچاڵی خۆی دەکات، چونکە شیعر بەو نادیارییەوە جوانە و هەر بەو نادیارییەشەوە ماوەتەوە و قسە لەگەڵ دونیا دەکات، ئەوانەش کە سەرچاوە خوازن قودرەتی ئەوەیان نابێ جاویدانی ببەخشنە دەقەکانی خۆیان، هەر بۆیەش ئەو شیعرانەی قەدەرێک لە جاویدانی و مانەوە هەڵدەگرن هی ئەو شاعیرانەن هیچ شوناسێکیان بۆ ماهیەتی شیعر پێ نییە، ئەوانە لە بنارێکی غەرق بوو لە تەمێکی خەستی لێکدانەوە کاردەکەن، پرۆسەیەکی فیزیکی بۆ لەناوبردنی شیعر ئەنجام دەدەن، هەر بەهەمان ئەو لێکدانەوەیە کە ئەتراکتیقی(.....) شیعر زیندوو لەوەدایە تۆ لە کەنارەکانەوە



چاوەڕوانی بکەیت، لە درزەکانی ڕۆحەوە بازرەقە بکات، شیعر هەڵگری شوناسێکی خودایییە، جاویدانییە غەیبانییە وەکو شەوقێکی نادیار دەسووڕێتەوە، کەم کەسن ئەوانەی ئەو شەوقە لە شیعردا دیل دەکەن، گەلگامێش بەوە زیندووە کە بەدوای زیندەگیدا دەگەڕا کە گەڕان بوو بەدوای مەحاڵ، ئەو جوانی لە مەحاڵ بۆ ئێمە جێهێشت بۆ بونیاتنانی زەینیەتێکی گەورە بۆ شیعر، بۆ بەغەیبانی کردنی شیعر کە خودی ئێستاتیکای شیعر لە بەغەیبانی کردنیەتی، لە بەمەحاڵ کردنیەتی، بەو مانایە نایە کە بەرهەمهێنەری لێکدانەوەیەکی فەلسەفی بێت، بەڵکو بەو چەمکەی کە هاومانان لەگەڵ مەحاڵ، ئێمە لەهەر شوێنێ بگەین بەچەمکە جوانەکانی شیعر لەویوە بە تەنها دەمێنێتەوە، لەهەر شوێنێ دەستمان لە قژی بیرۆکەیەکی شیعری جوان گیربوو لەوێدا شاعیر تەنهاترین ئەو کەسانەیە کە وێڵە بەدوای شیعر، بەدوای مەحاڵ، دەستگیرکردنی مەحاڵ غایەتی شیعرە، بڕوانە هاوارێکی گەورە هەبوو بۆ شیعر دوای سەرهەڵگرتنی ڕامبۆ بۆ جەبەشە و هەندەران کە ئەو هەواڵەیان دا بەڕامبۆ کە هەراو زەنایێکی زۆر هەیە لە بارەی شیعرەکانیەوە لە فەڕەنسا، بۆچی ناگەڕێتەوە، لە وەڵامدا گوتی (ئەوکاتە کە لە فەڕەنسا شیعرم دەنووسی، منداڵ بووم، هیچم نەدەزانی، بەڵام ئێستا گەورە بووم و توانای نووسینی شیعرم نەماوە) ئەمە گوزارشتە لە منداڵێتی هونەری شیعر...

گوزارشتە لەو مەحاڵەتی منداڵ و عەوداڵی بەدیهێنانی مەحاڵ. هەربۆیەش تا ئەبەد شیعر ڕەنگی منداڵێتی فڕێ نادات، کە بۆ دواجاریش بەر لە سەرهەڵگرتنی و جێهێشتنی فەڕەنسا (فرلین)ی لەبارێکدا بینی و بێ چەندو چوون گوتی دەستت بخەرە سەرمێز یەک دەرنافیسی لە دەستی دا و خوێنی بازرەقەی کرد و لەوێوە ئاسۆی شیعری ڕامبۆ کوژایەوەو ئیدی ببڕای ببڕ نەگەڕایەوە فەڕەنسا و کەڵکەڵەی گەڕان و سووڕان و سەفەر جێی منداڵێتی شیعری گرتەوە پاراستنی جێی مەحاڵ گیری گرتەوە، سنووری وڵاتانی بڕی ڕۆحی پڕاوپڕی شیعری خۆی بە سەرکێشی و بێهوودەیی گۆڕییەوە، زەمەنی ئەوە بەسەرچوو بتوانین بە (تەئەمول) شیعرێکی گەورە بنووسین، زەمەنی ئەوە هاتوو بە شیعر (تەئەمول)ێکی گەورە خەڵق بکەین، لە تەئەمولدا ئەندێشەی دەستگیرکردنی وێنەیەک، حەقیقەتێک، جەستەیەک دەکەین، کە هاتە دی مەودا بۆ شیعر نامێنێ، بەڵام لەشیعردا ئەندێشەی ڕەها بوون و مەحاڵ و

غەیب دەکەین کە هەرگیز بۆ شاعیر نایەتە دی و مەودا بۆ شیعر بەکراوەیی دەمێنێتەوە، بەردەوام واڵە، ئەو شوانەی کە عاشقی خودا بوو و لە پەنا بەردێکا هەموو خۆرائاوابوونێک خۆی و جامێ شیعر دەوەستا و چاوەڕوانی خودای دەکرد، بەڵکو بێت و قومێ شیر بخواتەوە، شاعیرێکی گەورە بوو، بەڵام ئاخ بەشیعر ئەو کارە ئێستاتێکییەی ئەنجام نەدا، چونکە ئەوە مەحاڵخوازی بوو، هەستی پێ نەدەکرد، مەلەکردن بوو لەناو جوانی شیعر. بەهەرحاڵ هێشتاکەش نازانین، دەریا قووڵترە یا ڕۆحی مرۆڤ، شیعر تا چەندی تر لەنێو ئەم مەحاڵەدا دەژێت بەو مەحاڵە چاوی خۆی دەرێژی و هەر بەو مەحاڵەش شەڕی ئەوانە دەکات بە شمشێری سەرچاوە مەیدانەکەیان تەنیوە، بەڵام هەمیشە وردو خاش دەبن، شاعیرانی مەحاڵ دەمێننەوە.

٢٥

هەروەک گوتم شاعیر گەمەکانی خۆی لە بەردەم وەبەرهێنانی مەحاڵدا ئەنجام دەدا، واتە شاعیر سەرسامە لە بەرامبەر سەرکێشییەک کە ئەنجامی دەدا نازانی دەکەوێتە کوێی ئەو دەهالیزەوە، ئەو بەردەوام دەبێت لە ڕۆچوون بەناو ئەو نادیارییە، بەڵام کە لەو سەرەوە دێتەوە یەک کۆمەڵ جاویدانی دەهێنێتەوە، ئیدی دەقیان لێ بەرهەم دەهێنێ، هەربۆیەش شاعیرانی داهێنەر لەهەر دەقێک کە بەرهەمی دەهێنن سەیر دەکەی دونیایەکی تازە دەبەخشنە خوێنەر، هەموو ئەو شیعرانەی بەم سەختییەوە دەنووسرێن سەرسامی بۆ خوێنەر دروست دەکەن، ئەمە یەکێ لە خاسیەتەکانی دەقی شیعری مەحاڵخوازە، هەڵبەت ئەگەر ئەمە لەبەرچاو نەگرێ جاویدانی نابێ، بەرهەمی شیعریشی توانای نەمری و جاویدانی نابێ، بەرهەمێکی زۆری شیعر هەیە لە کوردستان، بەڵام دیدگاییێکی کەم هەیە بەم پێودانگە بۆ شیعر بچێ، هەڵبەت هەموو شاعیرێکیش ناتوانی بچێتە ناو ئەم پرۆسێسە، چونکە پێویستی بەقەدەرێکی زۆر لە هیلاکی و خودنخوونی هەیە، پێویستی بە تاوانەوە و عەشقێکی زۆر هەیە، پێویستی بەفرێدانی کتێبێکی زۆر هەیە لەدوای خۆیەوە، شیعری چاک هەڵگرتنەوە شتە جوانەکانی ناو زەینە لەدوای خوێندنەوە ئەو شتە جوانانەی، دەقە جوانەکان لەناو زەین و بیری شاعیر دروست دەکەن، جا ئایا ئێمە



لەنێو سەختداریێتی نووسینی شیعر بەهەمان ئەو شێوەیەی من باسی دەکەم چۆن دەتوانین بالانسی بکەین لەگەڵ کات و چەمکی کات، چونکە کاتی نووسینی دەقە شیعرییەکانی کە سەرسامی بەرهەم دێنن هێند تیژپەڕە زۆرجاران قودرەتی ئەوەمان نییە بەم تیژپەڕییە ڕابگەین، بۆیە زۆر جاران ئەو هەموو مەعالیمە جوانانەمان لەدەست دەچێ و ئەو هەموو مەرجانە ڕەنگاوڕەنگاانەی بیرۆکەی شیعری و شەوق و جوانی ئەو ڕستانەمان لەکیس دەچێ و بۆ ئەبەد جارێکی دیکە نایدۆزینەوە، هەرکاتێک ئەم کاتە تیژپەڕەی شیعرمان بۆ ڕاو نەکرا ئیدی بۆ ئەبەد ناوەرۆکی دەقەکانیشمان لەگەڵ خۆیان دەباو دووبارە بە تەنها دەمێنینەوە، تەنهایی و دەستەپاچەیی لە بەرامبەر ئەم کاتە تیژپەڕانەی کە مەحاڵ پێمان دەبەخشێ.

لەچوارچێوەیەکی زەمەنی دەست نیشانکراودا، سەختترین و نائومێدترین ساتن بۆ ئەو شاعیرانەی کە ڕەچاوی هاتنی ئەم کاتە خوداییە دەکەن، هەربۆیەش شاعیر ئەگەر مەرحەمەتی مەحاڵ بەهەند هەڵنەگرێ دەقی چاک بەرهەم ناهێنێ، کەواتە پرۆسێسی دەستگیرکردنی مەحاڵ پەیوەستە بەبۆسە دانانەوە بۆ ئەو پارچە کات تیژپەڕانەی مەحاڵ لەبەرامبەر شاعیری ڕاستەقینە لەدەستی دەدا باشتر لەدەستی دێتە دەرەوە، من پێم باشە کێشەیەک دروست نەکەین بۆ شیعر لەنێوانی ئەم باسە سەختەدا، دەبێ خودی شاعیر ئەمە بۆ خۆی لەبەرچاو بگرێ نەک بۆ خوێنەر، چونکە خوێنەری باشی شیعر لەکاتی خوێندنەوەی دەقی شیعری بەدوای سەرسامییەک دەگەڕێ دڵ و دەروونی ئاو بدات، مەوجوداتی زەینی پەرش و بڵاو بکاتەوەو ڕۆحی بخاتە سایەدییەوە، چونکە شاعیر تاکە پەیوەندسازە لە میانی مەحاڵ و کات و خوێنەردا، ئەو وەستای ناو ئەو هەموو بویەرە نادیارەیە کە یەکەم جار لە زەینی خۆی دروستی دەکا و پاشان لە زەینی خوێنەر، بەم جۆرە ئەو سێ ئەقنومە قەبارەیەکی لێکدانەپچڕاون.

٢٦

ئەمە پێویستی بەکارێکی ئارکیولۆژی هەیە، پێویستی بەهەڵدانەوەی تەبەقەکانە... یاخود جوانتر پێویستی بە خۆهەڵگردن و شۆڕبوونەوە هەیە، ئێمە لەم کەونە پان و بەرینەدا شتێکمان لێ ون بووە، نازانین کەوتۆتە کوێی ئەم کەونە بەرینە، چۆن بۆی

بگەڕێین ئەم شتە بچووکە بۆ ئێمەی شاعیر مایەی مانەوە و زیندووبوونە، مایەی خۆسەلماندن و وەلامدانەوەی پرسیارەکانی ڕۆحە کە ئەویش شیعرە، کەسێک هەیە، هەڵبەت هەیە دەپرسێ، ئەم هەموو کوێرەوەرییە بۆچی؟ بەلام وەلامەکەی زۆر سادەیە سەبارەت بە شاعیر نەک ئەوانی دیکە، ئەویش دڵدانەوەی خودە، سەلوایەکە بۆ ڕۆحی شاعیر، دەمێنێتەوە جوانی... ئاخ دونیاش بێ جوانی شتێکی ناشیرینە چ جای شیعر، جا لەنێو ئەم پرۆسە سەختە چۆن بۆ شیعر دروست بکەین، ئێستاتێکا بەخشین بەشیعر سەختترە لە خودی ئەم پرۆسێسە، کارەکانی مەحاڵ سەخت و دژوارن جوانییان لەنێوان درزە عاسێکانی خۆیدا شاردۆتەوە، پێویستییان بە کەسێکە مەلە لەناو ئەو درزە عاسێیانە بکات.

بیرمە شیعرێکم خوێندەوە کە هی– ئەلفرێد دی موسیە– بوو، شاعیر باس لە گەڕان و سووڕانی مەلێک دەکا بۆ ئەوەی خۆراکێک پەیدا بکات بۆ بێچوەکانی دیارە مەلەکە دەریایی بووە، بۆیە هەموو دەریاکان گەڕا... یا دەریا گەڕا بەلام هیچی دەست نەکەوت، بەناچاری لە بەرامبەر بێچووەکانی چووە سەر بەردێک دەنووکی خۆی لەدڵیا بردە خوارەوە و دڵی خۆی بەخشی بە بێچووەکانی، دروستکردنی ئێستەتێکاش لەشیعرەدا هەروایە شاعیر دەبێ خوێنی دڵی خۆی ببەخشێتە دەق بۆ ئەوەی ڕەنگرێژی ئیستەتیکا بکات، ت. س. ئەلیوت لە نووسینی شیعری وێرانە خاکدا جگە لە راڤەکردنی کۆمەڵێک دەقی پیرۆزی مەسیحیان هیچی دیکەی نەکردووە، بەلام کاتێک شیعرەکە دەخوێنیتەوە جوانییێکی ئەوتۆی بەخشیوە بە شیعرەکانی ئەم دەقە، هەست دەکەی تازە لە سەفەری مەحاڵ گەڕاوەتەوەو یەکە یەکە ئەو درزانەمان بۆ باس دەکا کە هەریەکەو شەوقێکی لێ دزیوە، ئێستەتیکا وشەو ڕستە دروستی ناکەن، بەڵکو مەلەکردن لەنێو ئەو مانایانە دروستی دەکات کە وشە و ڕستە هەڵیان دەگرێ، پەیوەندی نێوان وشە و ڕستە و هەڵگرتنی ماناکان ئیستەتیکا دروست دەکات.

شکسپیر لە (تیمونی ئەسینی) هەمان ئەو تەکنیکەی بەکارهێناوە، وشە و ڕستەمان دەداتێ، بەلام لەگەڵ هەر وشە و ڕستەیێ دەمانگەڕێنێتەوە ناو هەزاران مانای سەردەمی ڕووداوەکەی خۆی، هەمان ئەم شانۆگەرییە درامایێکی شیعری تراژیکە، کە گەورەترین قەبارەی ئیستەتێکی دروست کردووە زیاتد لە هەموو



بەرهەمەکانی، هەتا لەکاتی وەرگێڕانیشیدا ئەو ئیستەتیکایەی لەگەڵ خۆی هێناوە... ماوەتەوە ئەوە بلێم، ئیستەتیکای ئەم تەرزە دەقە شیعرییەی من باسی دەکەم، جیاوازە لەگەڵ ئیستەتیکای شیعرێکی ڕۆمانسی کە بە تەنکی بەسەر شیعرەکەدا دراوە، بەلام ئیستەتیکای شیعری مەحاڵ لەناو خوێن و ئێسقانەکانیدا لێ دەداو لە قووڵاییەوە بەرەو زەینی خوێنەر هەڵدەچێ و شەلاڵی پرسیارمان دەکات.

## ٢٧

گومانی شیعر پێداویستییە بۆ ڕێکخستنەوە و دووبارە دروستکردنەوەی ڕۆحی پەرش و بڵاوبووی مرۆڤ، ئەو مرۆڤەی کەوتۆتە ژێر باری هیلاکییەکانی ژیان، ئەو مرۆڤەی ژیان بەرەو مەرگ و نائومێدی ڕاوی دەنێت، هەروەاش هۆیەکی گرنگە بۆ جێ پێ لەقکردنی ئەو یەقینەی هەزاران ساڵە لە ناخ و بیری مرۆڤدا ڕسکاوە و هانی دەدات قبووڵی ئەو ژیانە بکات بەوەی کە ژیان شیرینە، گومانی شیعر بۆ بەڕاستی شیرینکردنی ژیانە کە یەقینە سەلەفی و چەسپاوەکان قورسیان کردووە، بە دەستەواژەیەکی دیکە شیعر لە نێو فەزای ئەگزیستانسیالیزمی دەژیت و هەڵگری کۆمەڵێک پرسیارن، ئەو پرسیارانەی یەقینەکان هەڵدەتەکێنن، وا لەمرۆڤ دەکەن بیربکەنەوە... بەلام شیعر نایەت بەزمانێکی فەلسەفی هەمان ئەو پرسیارانە ئاراستەی مرۆڤ بکات، بەڵکو بەزمانێکی ئیستەتیکی قسە لەگەڵ ئەو مرۆڤە دەکات، جۆرێک لەسەرسامی و حیرەتی بۆ دروست دەکات، ختووکەی دەدات بۆ ئەوەی تەئەمولی بۆ دروست بکات و تۆزێ دوورکەوێتەوە لەو هیلاکییانەو بکەوێتەوە سەر ئەسڵی جارانی کە مرۆڤێکی ڕووت بووە، گۆران پرسیاری فەلسەفی کردووە بەلام لە ڕێگەی جوانترین دەقی شیعری (چییە ئەی ڕۆحی بێ لێوار و بێ پەی لە تۆ ناشارەزایی من هەتا کەی؟).

تەواوی فەلسەفەی وجودیش لە چەمکی ئەم دوو دێڕەدایە، بەلام گۆڕانکاری لەناو جوانی و ماناو مەحاڵ کردووە فەلسەفەی دانەڕشتووە، ئەمە خەملاندنی گومانی شیعرە لەناو دەقدا، کوشتنی هەموو ئەو وەلامانەیە کە سەلەفییەکان دایانڕشتووە، هەربۆیەش گومان هۆیەکە بۆ ئیزافەکردنی جۆرێک لە ئیستەتیکا بۆ شیعر.. هەڵبەت بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، هەموو ئەو شیعرانەی هەوڵ دەدەن مرۆڤ لەرێگەی بەیەقین

کردنی ناوەرۆکی شیعر ئاسوودە بکەن، خۆیان دەکوژن و کۆتایی بەشیعر دەهێنن و ئاسەوارێک لەڕووی جوانی و بیرکردنەوە جێ ناهێڵن..

نیتشە فەلسەفەی نەنووسیوەتەوە، کۆمەڵێک دەقی پەخشان ئامێزی نووسیوە کە هەڵگری بنەماکانی فەلسەفەن، زیاتریش ڕاڤیارەکان نیتشەیان خستۆتە قاڵبی فەلسەفەوە. ئەگینا لە کتێبی (بەڵێ زەردەشت ئاوەهای گوتووە) من پێم وایە هەمووی لە پەنا بەرد و درەختەکانەوە خستۆتە ڕوو، لە پەنا کاریگەرێتی سروشتییەکانەوە فڕێی داونەتە ناو دڵی مرۆڤ.. نووسینەکانی نیتشە ئەوەندەی دەچنەوە ناو دڵ ئەوەندە ناچنەوە ناو ئەقڵ بەو پێیەی کە ڕۆحی گومانی شیعر بەسەریاندا زاڵە، قسە لەگەڵ خوێن و دڵ دەکات و قسە لەگەڵ زەین و سەر ناکات...

۲۸

قسەکردن لەمەڕ شیعر پێویستی بە دوورخستنەوەی چەمکی حەقیقەتە، کاری شیعر بەرهەمهێنانی حەقیقەت نییە، ئەوە لە مەودایەکی دیکە کاری بۆ دەکرێت، بەڵام پەیوەندی نێوان شیعر و وەهم پەیوەندییەکی ئەزەلییە، شیعر جگە لە وەهم شتێکی دیکە نییە، وەهمێک، بتوانێ حەسانەوە بدا بەرۆح و پێیەوە بژیت و بەردەوام بێت، میللتن لە- فیردەوسی ون- جگە لە داڕشتنی ئەو وەهمە هیچی دیکە ناڵێت، وەهم لەمناڵدانی هەمان ئەو مەحاڵە لەدایک دەبێت کە پێشتر باسمان لێوە کرد، لەهەمان ئەو چرکە خێرایە کە زەینی شاعیر بەرهەمی دەهێنێ، هەموو شاعیرەکان ئەگەر بەڕاستی دەقی زیندووی شیعر بەرهەم دەهێنن، ئەوە هەڵگری گەورەترین بڕی وەهمن، هەمان ئەو شاعیرانەی پێیان وایە شیعر وەهم نییە هەوڵی بەرهەمهێنانی حەقیقەت دەدەن لە شیعر بۆیە دەقەکانیان هەموو شتێک بێت شیعر نییە، سیحری شیعر لە بە وەهمکردنی ناوەرۆکیەتی، هەمان ئەو ڕایە نەک هەر بەسەر شیعرەوە دەچەسپێ بەڵکو تەواوی ژانرەکانی دیکەش دەگرێتەوە، خۆ ئەگەر دانتی بەهەمان ئەو وەهمەوە نەچووبایە ژێر باری باسکردنی هەقیقەتەکانی ئەو میحراجەی کە کردی- دۆزەخ و فیردەوس و پاکستان- مگهر- ئەوا هەموو ئەو دەقانەی کە لەو کتێبەدا نووسیویەتی دەبوون بە شتێکی دیکەی دەرەوەی دەقی ئەبەدی، بەڵام قەدەرێکی گەورەی لە هونەری وەهم بەخشیوە بەم شاکارەی خۆی بۆیە تائێستاش جاویدانی



بەخۆیەوە گرتووە، وەهم کاری وەهم بەرهەمهێنانی میوزمێنتە لە شیعر، کە خوێنەر بەدوایدا دەگەڕێ، شیعر حەقیقەت نادا بەدەستەوە بەڵکو لە هەقیقەتەکانی ڕادەکات و دەشتاییەکانی هەڵدەبژێرێ، سەنتەرەکان جێ دەهێڵێ و پەراوێزەکان دەکاتە موڵکی خۆی، کاری شیعر چ لەخوێندنەوە و چ لە نووسیندا کە کردنێکی سیحراوییە لەناو ساتەوەختەکان، مەودای هەڵگرتنی حەقیقەتی نییە، سووربوونی گوڵە کێوییەکان حەقیقەتی سروشتە لە شیعر باسی بکەیت و باسی نەکەیت هەیە، بەڵام کاتێک گوڵێک لەبن تاشە بەردێ لە تاو سەدان هەزاران باراندا یەکجار نمە بارانێکی بەردەکەوێ بەڵام لە هەموو گوڵەکان جوانتر دەبێ ئەمە کاری شیعرە چونکە تێپەڕی حەقیقەت دەکات و سەرسامی وەبەر دێنێ، ئەوە وەهمی شیعرە.

۲۹

هەڵبەت سیحر گەمەیەکی جوانە و بەرامبەر، بەرەو سەرسامی دەبات، گەمەی پەنجەکانی ساحیر هێندە خێراو تیژپەڕن مەودایەک بۆ چاو ناهێڵن و هێزی موگناتیسی پەنجەکانی ساحیر بەهێزترە لە هێزی تێڕوانینی چاو بۆیە وەهمێک لەلای بینەر خەڵق دەکات، جا خەڵقکردنی ئەم وەهمە لە لای ساحیرەوە زۆر پەیوەندیدارە بەخەڵقکردنی شیعر لەلایەن شاعیرەوە لەوکاتە تیژپەڕەی کە لەناو مەحاڵدا دەیگرین وەک چۆن باسمان کرد، ئەو جادوو ئەفسوونەی سیحر بەرهەمی دەهێنێ شاعیر بەهەمان ستایل بەرهەمی دەهێنێ، بۆیە پەیوەندییەکی زۆر هەیە لەمیانی سیحر و شیعر، من بەر لە حەڤدە ساڵ لە یەک لە چاوپێکەوتنەکان گوتوومە کە شیعر ئاینی شاعیرە، بۆیە شاعیری ڕاستەقینە هەمیشە هەوڵ دەدا قودسیەتێک بداتە پرۆسێسی نووسینی شیعر لە ئاستیدا سەردانەوێنێ و نزاکانی خۆی بەڕێکات. شیعر بەر لە ئاینەکان هەبووە، ئاینی شیعر کاریگەرێتی خۆی خزاندۆتە سەر ئاینە ئاسمانییەکانیش، تەنانەت پەیامە ئاینییەکان زمانێکی پەخشانی شیعریان بەسەردا زاڵە خۆ ئەگەر سەیری مەزامیرەکانی داوود بکەین، شیعر بە هەموو مەعالیمەکانیەوە لەو دەقانە ڕەنگدەداتەوە، بەڵام پەیامی ئاینی شیعر جیاوازە لەگەڵ پەیامی ئاینیە ئاسمانییەکان، ئاینی شیعر پەیوەندییە ڕۆحییەکان لەمیانی مرۆڤ دروست دەکات و خەون و خەیاڵیان جۆش دەداو تەڕ دەکاتەوە..

٣٠

لەڕاستیدا من نامەوێ بۆچوونەکانی خۆم بەسەر هیچ یەک لە شاعیرەکان پراکتیزە بکەم، چونکە ئەو شتانە گوزارشت لە چۆنیەتی نووسینی من دەکات، کاتێکیش شاعیر گوزارشت لە بیروڕاکانی خۆی دەکات ئەوە بەدڵنیاییەوە دەڵێم خۆی چۆن دەنووسێ ئاوا قسە دەکات... من شاعیرانی دەوروبەری خۆم دەخوێنمەوە ڕێزیان لێ دەگرم، حەزدەکەم بزانم نێوەندی ئێمە گەیشتوونەتە چی، ئایا ئێمە نەوەیەکین هێزو برستی گۆڕان و تازەبوونەوەمان هەیە، ئایا قودرەتی فرێدانی دەقێکمان هەیە کە جیهانبینیمان پیشان بدا، ناکرێ بەدرێژایی ئەزموونی خۆمان شیعر بنووسین نەشتوانین بەرهەمهێنەری جیاوازی بین، ناتوانین هەڵگری شوناسێکی جێگیر بین و لەبەرداشی کۆتاییدا وشک هەڵگەڕێین، نموونەی شیعریمان هەن خەونی ئەوانی دیکە هەڵدەگرن و هیلاکی و شەونخوونی پێوە دیارە.. ماوەیەک لەمەو پێش چەند کۆمەڵە شیعرێکی- دڵشاد عەبدوڵلا- ی شاعیرم خوێندەوە هەر لە شیعرەکانی پێش بەفرنووس و مانگی نیوە مۆر و گۆمی پونگ و حەج و دواییش کۆدیوانی ئەم شاعیرە، من هەست دەکەم شیعرەکانی دڵشاد عەبدوڵلا وەک چۆن لە پرسیاری یەکەمدا باسم کردووە هەڵگری قەدەرێکی زۆر لەدەستگیرکردن و ڕاوکردنی کاتە تیژپەڕەکانی ناو سنووری مەحاڵن، نیگەرانییەکی شیعری بەهێز پارسەنگی بیرۆکەی ئەم شاعیرە دەکەن و تیماکانی بەشیعریەت ڕەنگڕێژ دەکەن، من بەر لە بیست هەتا بیست و پێنج ساڵ، شیعری دڵشادم خوێندۆتەوە و لە گەرمەی گروپ و گروپخوازیدا، لەناو هەموو شەوقەکانی ئەو سەردەمەش شەوقێکی بەهێزترم دەبنیی لەوانی دی، هێزو خوێنێکم دەبینی لەدەقەکانی کە خوێنەریان دەوەساند و ناچاری هەڵوەستەیان دەکرد... ئەوکاتەی- شەوێ لە شەوانی سارد- یا شەوێکی ساردی نووسی، زانیم ئەویش لەو کەسانەیە کە لە سەرەتا باسم کرد بەرهەمهێنەری سەرسامییە لە شیعر، ئەو شیعرانەش کە سەرسامی بەرهەم دەهێنن لە ئەزەلەوە باوەڕیان بەدروشم نییە، باوەڕیان بەئیدعای گەورە نییە، بەڵکو هەمیشە ئەوانەن کە لەنێو بەرزبوونەوەی هەراو زەناو دەنگ و دەنگۆیی، مێزە هێمنەکانی شیعر هەڵدەبژێرین.. جارێکی دیکەش باسم کردووە کە نموونەی شیعر (ژەهر و قەڵا)



دەقێکی زیندووی بۆ ئەدەبی کوردی دروست کردووە، بەهەرحاڵ دەکرێ نموونەی دیکەش هەبێ باسیان بکەم کە ئەمرۆکە لە پانتایی شیعری کوردیدا دیارن.. کارکردنی بەختیار عەلی لە نێو دارستانە چڕەکانی مەحاڵ و دەستگیرکردنی ساتە وەختە تیژپەڕەکانی شیعر نموونەیەکی دیکەن لە شیعری چاک، ئەو شیعرانەی دەکرێ شاعیر بۆ ماوەیەکی درێژ لە بەرامبەریانا بوەستێ... ئەم دوو نموونەیە ڕێک لەگەڵ ئەو وەڵامانەی من داومەتەوە هاو ئاوازن... نموونەی دیکەش هەن بەڵام لێرەدا باسیان ناکەم، لە هێنانی ئەم دوو نموونەیە مەبەستمە ئەوە بڵێم شیعرێکی زۆر دەنووسرێ زۆریان دەخوێنمەوە... بەڵام ئەوانەی هەڵوەستە دروست دەکەن، لەگەڵیان دەمێنمەوە و بە هی خۆمیان دەزانم و دەزانم خاوەنەکانیان ئەوانەن کە بەیەکەوە لەناو سنووری سەختی شیعردا دەژین.. ئەو ڕووەکانە بۆ ئەوە سەریان لەناو تاشە بەرد هێناوەتە دەرەوە تا باس لە هێزی بەرد بکەن و پێناسەی تاوێرەکان بکەن.

٣١

خوێندنەوە کارێکی زەحمەتە ئەگەر خۆتی لەگەڵ ڕانەهێنی ناتوانیت بەردەوام بیت، لەسەری چونکە خوێندنەوە عەشقە، عەشقی کەشفکردن و چوونە ناو ناخی ئەوانی دیکەی بواری ئەدەبی، ئێمە کۆمەڵێک هەر لە سەرەتاوە کتێبمان کردبووە پەنای خۆشەویستی و سیاسەت، کتێب ئێمەی پەروەردە دەکرد بۆ بیرکردنەوە و لە چارەنووسی جەستەمان لە سەردەمە سەختەکاندا، چارەنووسی نەتەوەکەمان، لە هەمان کاتدا تۆوی جوانی و عەشقی لەناخی ئێمەدا دەچاند، خودی ئەو سامی هادیەی کە ئێستا سەرپەرشتی ئەم ڕۆژنامەیە دەکات، لە گەڕەکێکی قوڕاوی و لە ماڵێکی قوڕی یەک دوو ژووردا، لەبەر کتێب ماڵەکەی خۆمان بەتەلاری قەیسەر نەدەگۆڕییەوە، کتێب بەشێکی هەرە گرنگی کەسێتی ئێمە سەقەت و نەخۆشین، ئەوە سەرەتای من بوو لە تێڕوانینم بۆ کتێب، هەر بۆیەش تێپەڕینی ساڵ و مانگان کتێب لە ناخی مندا بوو بە دڵ کە ئێستاکەش بەو دڵە دەژیم، من هیچ کاتێکی دیاریکراوم نییە بۆ خوێندنەوە و هیچ بەرنامەیەکم نییە بۆ دابەشکردنی کات، لە سەرەتای خوێندنەوەم بەرنامەیەکم هەبوو بیرمە نووسەرم هەڵدەبژارد و هەرچی بەرهەمی ئەو نووسەر هەبوو هەموویم کۆ دەکردەوە و هەر هەموویانم بەسریاڵ دەخوێندنەوە تا

تەواو شارەزای جیهانی ئەو نووسەرە دەبووم، لەوانە شەکسپیر، کامو، کولن و ولسن، دیستویڤسکی، سارتەر بەتایبەتی ئەدەبی ئەگزیستانسیالیومی و زۆرانی دیکە...

هەرکاتێک ویستم کتێبێ بخوێنمەوە کە حەزم لێیەتی و بەدەستم کەوێت شەو رۆژ و سەعاتی بۆ نییە یەکسەر دەستی پێدەکەم، یەکێ لە خاسیەتەکانی خوێندنەوەی من ئەوەیە بیر لەوە ناکەمەوە دەوروبەرم چۆل یا ئاپۆڕەیە، من دەچمە ناو کتێبەکە ئیدی ئاگام لە دەوروبەرم نامێنێ، لە ساڵی ١٩٧٧ برادەرێکم هەبوو کە عاشقی خوێندنەوە بوو ناوی- عەلی عوسمان- بوو ئێستا لە ئەورووپایە زۆر کتێبمان لەگەڵ یەک دەگۆڕییەوە بیرم دێ لە یەک هەفتەدا، ڕۆمانێکی کولن ولسن- طقوس في الظلام- و سێ بەرهەمی شەکسپیر- ڕیشاردی سێ، هاملێت، مەلیک لیرو ڕۆمانێکی تورجنیف- میاه الربیع- و ذکریات في بیت موتی دیستویڤسکی و کتێبێکی (طراد الکبیسي)مان خوێندەوە، هەڵبەت بەیەکەوەش گفتوگۆمان لەسەر دەکردن، ٧٩-٨٠ بەرەو سەر ئیدی شالاوی خوێندنەوە بوو بەمەرجی مانەوە و گفتوگۆ لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێی ئەو سەردەمە بەتایبەت من و کاک هاشم سەراجی شاعیر و محەمەد باوەکرو دڵشاد عەبدوڵڵای شاعیر و مەحموود زامدار و ڕزگاری ئەندازیار کە لەبارەی سینەماوە کاری دەکرد.. ئەو سەردەمەش لەبەر هۆی ئابووری هەموومان کتێبەکانمان بۆ نەدەکڕدرا، بەڵام لەیەکمان وەردەگرت و دەمانخوێندەوە، هەڵبەت وێڕای ئەم پرۆسەیە نووسینی شیعریش بەردەوام بوو، بەشداری کردن لە بینینی پیشانگا و شانۆگەری و کۆڕەکانیش بەردەوام بوو، بەرهەحاڵ ئێمە کۆمەڵە شێتێکی سەیری کتێب بووین، ڕۆژگارمان لە پەڕی کتێبەوە دەناسی، ئێمە بە کتێب خۆمان ناسی و ئێستێکەش هەروا بەڕێوەین...

ئەی کتێب ئێمە هاوڕێیەتی تۆمان هەڵبژاردووە تۆش حیکمەتەکانی خۆت ببەخشە بە ئێمە؟ ئێمە کۆمەڵە مرۆڤێکین ڕۆحمان شکاوە تۆش سارێژمان بکە.

### ٣٢

هەڵبەت زۆر باس لەو گرفتە کراوە کە زۆر جار شاعیران لە ئەنجامی قووڵ نەبوونەوە و ڕامان لە دەوروبەر و بویەردا تووشی جۆرێک لە نەبینینی ڕاستەقینەی



شتەکان دەبن، ئەوەش وا لە شاعیر دەکات لە کاتی فڕیدانی دەقەکانی خۆیدا، تووشی جۆرێک لە ئاڵۆزی ببێت لە گوزاشت کردندا نەبینینی واقعی شیعر، مەبەستم لێرەدا مەسەلەی واقیعییەت نییە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە بڵێم شاعیر بەرلەوەی ببێتە خودانی شوناسی خۆی و بەرلەوەی بتوانێ جیهانبینییەک بۆخۆی پەیدا بکات دەست بە نووسینی شیعر دەکات، کە ئەمەش وادەکات هەمیشە لەناو ناکامڵیدا بژیێت و تا دوارۆژەکانی شیعر نووسینی ناتوانێ جۆرێک لە ئیستاتیکا لەناو دەقەکانی خەڵق بکات، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەوانەی هەوڵ دەدەن کە هەمان ئەو شوناسە شیعرییە و هەمان ئەو جیهانبینییە دروست بکەن، لەناو دەقەکانی خۆیان، هەمیشە دەقی جوان فڕێ دەدەنە ناو پانتایی شیعری کوردی، ئێمە نموونەمان زۆرە لە ئەدەبی کوردی لە ڕووی شیعرەوە کە توانیویانە ئەم پرۆسێسە شیعرییە بە کامڵییەوە بە کۆتا بگەیەنن، من ئەوانە بۆ نموونە لە شیعری خۆماڵی چەند ناوێک دەبینم، لەوانە سەیری شیعرەکانی (دڵشاد عەبدوڵڵا) بکە لە (گۆمی یونگ)، (تێنوێتیم بە گڕ دەشکێ)ی شێرکۆ بێکەس و (نیگەرانی)ی (نەوزا ڕەفعەت)و هەندێ: لە شیعرەکانی (هاشم سەراج)دا.

هەڵبەت لە ئەدەبی جیهانیدا گرفتی وەرنەگرتن و مشتەماڵکردنی ئیستاتیکا لە شیعردا زۆرە، کە تووشی گرفتی ئاڵۆزی بووینە، لە کاتی دەقرێژکردنی خۆیاندا، بۆ نموونە (ت. س. ئەلیوت) لە (وێرانەی خاک)دا بە شێوەیەکی هێجگار نایاب لە ڕووی فکرەوە هەڵدەڕژێ، بەڵام کاتێک دەگاتە بەشی (پیاوە پووچەکان) دەکەوێتە نێو کێشەی نەبین و دوورکەوتنەوە لە جیهانبینی خۆیەوەن بۆیە شیعرییەت ئا لەوێدا دەفەوتێت، هەرواش ئەم حاڵەتانە لەناو شیعرەکانی (بۆدلێر و ڕامبۆ و مالارمێ)شدا هەیە، من ڕەنگە لە سەرەتای ئەزموونی شیعری خۆمدا و لە ئەنجامی شارەزانەبوون لە دنیای فراوانی شیعردا نەمتوانیبێ بەهەمان ئەو جیهانبینییەوە سەیری دنیا بکەم و خوێندنەوەیەکی باشم هەبێ بۆی، ڕەنگە لەو قۆناغەی شیعر لەم دیاردەیەم نووسیبێ، بەڵام کە کەوتمە ناو قووڵایی کێشەکانی شیعر هەر زوو ئەم دیوارەم لەبەردەمی خۆمدا ڕماند.

ڕەخنەگرەکان دەتوانن ئەم کێشەیە یەکلا بکەنەوە، چونکە ناکرێ من باسی ئەزموونی خۆم بکەم.

## ٣٣

مەسەلەی بە ئایدۆلۆژیکردنی شیعر یا توخم ڕێژکردنی شیعر بە مەسەلەی سیاسی و ئایدۆلۆژییەکان مەسەلەیەکی دێرینە هەر لەو سەردەمەوە دەستی پێکردووە کە گریکەکان خەونی خۆیان گێڕاوەتەوە و جۆرێک لە ڕێبازگەراتییان لەناو شیعردا چاندووە. من بۆ خۆم پێموانییە شیعر جێگەی دروشمە ئایدۆلۆژییەکانی تێدا ببێتەوە، چونکە شیعر لە بنەڕەتدا بۆ جوانی ڕسکاوە و بۆ بەرجەستەکردنی جوانییەکانی خولقاوە، دەشێ شیعر بتوانێ بە شێوەیەکی هێجگار جوان مەسەلەیەک لەو مەسەلانەی کە سیاسەت وروژاندوویەتی بخاتە ناو شیعرەوە بەڵام ئەگەر هاتوو شاعیر بتوانێ بە هەمان ئەو مەسەلەیە لەناو چوارچێوەیەکی جەمالی جواندا دابڕێژێ سەرکەوتن بەدەست دێنێ، بیرۆکەی بە ئایدۆلۆژیکردنی شیعر وەک وەک دیاردەیەکی زەق لە سەردەمی دوا شۆڕشی ئۆکتۆبەری کۆمۆنیستی هاتە کایەوە کاتێک شاعیرانیان ناچار دەکرد بچنە ناو کێشە سیاسییەکانەوە دەورو خولی پارسەنگە سیاسییەکان بدەن و شیعری کرێکارخوازی بنووسن. ئەوەبوو لەبەر یاخیبوونی کۆمەڵێکی زۆر لە شاعیرەکان لەو داوا نارەوایە دوورەپەرێز کران، چەندانێکیش شیعری لەم جۆرەیان نووسی، هەندێکی دوورخرانەوە لە زێدی خۆیان، هەر لەبەر ئەوەی نەیانویست لە ڕۆحانیەتی شیعری خۆیان بدەن و بچنە ناو نووسینی شیعری سیاسییەوە، وەیان دەقی دیکەی سیاسییەوە. بۆ نموونە (بۆریس باسترناک) هەر زوو نەفی کرا، ئەم جۆرە نووسەرانە لەبەر دوورکەوتنەوەیان لە ئایدۆلۆژیا بە مرۆڤی زیادە لە قەڵەم دەدران.

بەهەرحاڵ ئایدۆلۆژیا وەک بوویەرێکی سیاسی بەرهەمهێنەری فۆرمەکانی خۆیەتی، بەڵام ناکرێ شیعر فۆرمێک بێت لە فۆرمەکانی ئایدۆلۆژی.

## ٣٤

لەبەرئەوەی سیاسەتیش فیکر هەڵیدەسووڕێنێت، تا ڕادەیەک ئەوەی کە سیاسەت هەندێ جار ئایدۆلۆژیایەکی دەستنیشانکراو هەڵی دەسووڕێنێت، هەندێ جاریش سیاسەت گوزارشت لە بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی دەکات، بۆیە لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا مەسەلەی ئینتیما دروست دەبێت، شاعیر لە کۆمەڵگە بەدەر نییە هەڵبەت



ئینتیمایەکی هەیە، هەندێ جار ئەو ئینتیمایە هیۆمانستییە و سەرتاسەری مرۆڤایەتی دەگرێتەوە، هەندێ جاریش ئینتیمایە بۆ لایەنێک. بەڵام شاعیری ڕاستەقینە لە هەردوو حاڵەتەکەدا بە دیدێکی ئینسانی گەورە سەیری مەسەلەکان دەکات و ناخزێتە ژێر داواکارییەکانی دەزگاکانی سەر بەو سیاسەتە. دەشێ ڕەخنەگری ئەم دەزگایانە بی و شیعرەکانی خۆی لە سەرووی ئەم دەزگایانەوە بەرهەم بهێنێ، هەڵبەت لە کوردستان شاعیرانی لەم جۆرەمان هەن، کە بانگەشە بۆ ئەو لایەنە دەکەن کە خۆیان تیایدا دەژین و سەر بە قەڵەمڕەوی ئەو لایەنەن، من ئەوە بە شتێکی ناشیرینی نازانم بەڵام ناشیرینی ئەوەیە کە هەموو ئەو شتانەی دەبێ ڕەوان، ئەو شتانەی دەبێ داکۆکییان لێ بکرێن، ئەو شتانەی حەقن بخەنە ژێرپێ، بە هەنجەتی لایەنگرێتی خۆیان، ئەمە کارێکی ناڕەوایە چونکە شاعیر دەبێ ڕووە ڕاستەقینەکان هەڵبژێرێ، هەرچەندە حەقیش چەمکی جیاجیای هەیە لە شیعردا هەرگیز جێگەی نابێتەوە، پەیامی شیعر پەیامی گەیاندنە، گەیاندنی ئەو پروشکە ئاگراوییانەی کە گوزارشت لە سووتانی مرۆڤ دەکەن، گەیاندنی ئەو بریق و نوورانەی کە لەناو سینەی مرۆڤدا هەڵدەچێ، شیعر پەیامی کاریزمە واتە پاکبوونەوە و داشۆران بۆیە هەرگیز ناتوانێ شیکەرەوەی بوویەرەکانی سەردەم بێت.

جا ئایا شاعیر دەتوانێ لە ڕێگەی شیعرەکانییەوە هەوڵی گۆڕانکاری دەوروبەر بدات، من پێموایە پاشان ئەمە پەیامی شیعر نییە، شیعر بۆ ئەوە نەهاتۆتە کایەوە گۆڕانکاری لەناو خەڵکدا دروست بکات، بەڵکو بۆ ئەوە هاتووە بەدیلێک بۆ ڕۆحی سووتاوی مرۆڤ دروست بکات. پەیامی شیعر پەیامی خولقاندنی جەدواییێکە بۆ ژیان هەڵگری پەیامی پرسێکی ئەزەلییە کە ئاخۆ مرۆڤ کەی بە تەواوەتی ڕزگاری دەبێت لە وەڕسی و دەرگای فیردۆسەکان دەکرێتەوە.

بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت کە شیعر گەڕانە بەدوای بەهەشتی ونبوودا، کە (میلتۆن) تەواو بەرجەستەی کردووە، ئەگەر بە وردی شیعرەکانی (ئەلفرێدی موسا) بخوێنینەوە بۆمان دەردەکەوێت شیعر گریانێکی ئەبەدی و غوربەتێکی هەتاهەتایە.

بە کورتی شیعر نوستالیگایە، کە ڕۆحی شاعیر بەسەر ڕابردووەکانەوە پەرت دەبێ، بۆ ئەوەی لە ئایندەدا بژیێت، بەڵام بەقەدەر ئەوەی کە باسم لە شیعر و شاعیر کرد، دەمەوێ ئەوەش بڵێم شاعیر دەتوانێ لە دەرەوەی چوارچێوەی شیعردا

بیرۆکەکانی خۆی بە ئاراستەی شیکردنەوە و هاندان تیۆرزە بکات و خەڵکی لە هەمان ئەم چەمکانە بگەیەنێت. دەکرێ بڵێم پیشەی شاعیر تەنها نووسینی شیعر نییە، بەڵکو شانبەشانی نووسینی شیعر پەیامێکی دیکەی لەسەر ئەستۆیە بیگەیەنێ، ئەوەیش لە دەرەوەی چوارچێوەی شیعر، کە پەیامی ئازادکردنی مرۆڤە لە هەموو کۆت و پێوەندە فیکرییەکان، کە ئەمە بنەڕەتی مەبەستەکانمە.

٣٥

رەخنە پرۆسێسی گرنگی هەموو سەردەمە شیعرییەکان بووە، نەبوونی ڕەخنە وای کردووە کەمتر شاکارەکان بەدیاربکەون، بەداخەوە ڕەخنەگرەکانمان خوێندنەوەیەکی ڕەخنەییان نییە بۆ سەرجەم شیعری کلاسیکی، چ جای شیعری هاوچەرخی کوردی، خۆ ئەگەر هەشبووبێ ئەوا ڕەخنەیەکی بێ فیکر بووە، واتە فیکر ڕەخنەکانی ئێمە هەڵناسووڕێنێ، هەندێ میزاجی تایبەت ڕەخنەکانمان گینگل دەدات، ئەمەش ئافەتێکی ناو ئەدەبی کوردییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هەندێ ڕەخنەگری گەنجی باش لە کوردستان سەریان هەڵداوە کە توانیویانە کار لەناو دەقە شیعرییەکان بکەن، بەتایبەتی ڕەخنەکانی (عەتا قەرەداغی) کە کارێکی باش لەناو دەقە شیعرییەکان دەکات، هەروەها (نەجات حەمید) کە بەدیدگایەکی تازە کار لەناو شیعر دەکات، من پێم باشە بڵێم کە (مەریوان وریا قانع) ڕەخنەگرێکی سەنگینی بواری شیعرە ئەگەر بیکات، وەک چۆن کاری لەناو هەندێ دەق کردووە، لە ڕاستیشدا کاری ڕەخنە زۆر قورسە پێویستی بە باکگراوەندی ڕۆشنبیری فرەلایەن هەیە، تا بتوانێ بەناو دەقەکاندا قووڵ بێتەوە ئێمە لەم سەردەمەدا پێویستیمان بە ڕەخنەگر هەیە. بتوانێ بەرگەی دیکتاتۆریەتی بیرو بۆچوونە سەلەفییەکان بگرێت و وردوخاشیان بکات.

٣٦

ئەمە گومانێکە تا ئاستی یەقین هەیە، بە بەڵگەی ئەوەی من گەلێ دەقی شیعری جوان و نایاب دەخوێنمەوە، هەر لەپاش بڵاوبوونەوەیان لەبیر دەچنەوە، چونکە هیچ کارێکی ڕەخنەییان بەدوادا نایەت، بەتایبەتی هەندێ لە شیعری گەنجەکان کە تەواو پشتگوێ خراون، خۆ مەسەلەی گرووپ و گرووپکاری ئاشکرا دیارە، پێویست ناکات پەنجەیان بۆ ڕاکێشین، ئەمەش لەوەوە سەر هەڵدەدات ئێمە نامانەوێ پڕۆژەیەکی



ڕەخنەیی جوان گەشە پێ بدەین و دایمەزرێنین خۆ ئەگەر ئێمە دووركەوینەوە لە مەسەلە نەرجسییەکان و مەسەلە میزاجییەکان ئەوسا بەرچاومان ڕوون دەبێت، شتە جوانەکان دەبینین داهێنان پەیوەست نییە بە کەسێک و لایەنێک، داهێنان پەیوەستە بە قووڵبوونەوەی شاعیر بە ڕامانی بێ کۆتایی. بەو فیکرەی شاعیر هەڵدەوەشێنێتەوە و دروستی دەکاتەوە، هەر بۆیەش گومان لەوە سەر هەڵدەدات بۆ گەڕانێک نییە بەنێو ئەو هەموو بەرهەمە شیعرییانەی بڵاودەبنەوە، کە ئەویش وای کردووە بەرهەمێکی زۆر و بۆر کەڵەکەی سەریەک بێت لەنێو ئەدەبی کوردیدا.

٣٧

کە بچینە ناو شیعر ئیدی زەمەنی کپی تەواو دەبێ و ژاوەژاو دەست پێ دەکات، ئەوەی خەریکی شیعر بێت دەستبەرداری ژیانێکی ئاسوودە و ڕۆحێکی حەساوە بێت، ئاسوودەیی و ڕۆحێکی لەناو ماڵی شیعردا جێگەی نابێتەوە، چونکە شیعر خوداوەندی پرسیارەکانە، ئەو پرسیارانەی کە هەرگیز وەڵامیان نییە، بەڵام شیعر بێهوودە وەڵامی وەهمی ئەوان دەداتەوە، کە هەتا وەڵامدانەوەکانیشی بریتین لە جۆرە پرسیارێکی دیکە، شیعر کۆژیتۆی پرسیارە یەک لەناو یەکەکانە، قەبارەیەکی گەورە لە وەهم، بەڵام وەهمێکی جوان، جوانییەک جیا لە جوانییەکانی دیکە، وەک ئەوەی (تۆماس مان) لە (مەرگ لە ڤینسیا) و (وایتمان) لە (چڵەگیا) و (ئیلییوت) لە (خنکان لە ئاو)دابە دوایدا دەگەڕان، نموونەمان سەبارەت بەو وەهمە جوانانەی کۆمەڵێک ڕۆحی گەڕیدەباز کردوونی، لە ئەدەبی کوردیشدا زۆرن بۆ نموونە (شێرکۆ بێکەس) لە (دەربەندی پەپوولە) گەورەترین وەهمی جوانی خوڵقاندووە، لەو پرسیارە قووڵانەی لە خۆی دەکات سەبارەت بەو کچەی لە باڕەکەدا لەبارەی باوکییەوە کردبوو، شێرکۆ لە ڕامانی خۆی خودی خۆی دادەڕێژێتەوە، سەبارەت بە هەمان پرسیار لەبارەی کچی خۆی پرسیارێکە کتێب هەڵدەگرێ، هەرواش سەبارەت بە پرسیارەکانی (دڵشاد عەبدوڵڵا) لە دیوانی (شەوی دووەم)دا لەناو ڕەحمی سروشتێکی جووڵە بەخشدا پرسیارەکانی دڵشاد دەچنە ناو پێستی ڕامانە قووڵەکان، بەڕادەیەک قسە لەگەڵ بەرد دەکەن و هەڵووژە دەدوێنن، گەلێ نموونەی دیکەشمان هەن شایانی ئەوەن ڕەخنەگرەکان بۆی بچن، بەم جۆرە من بە درێژایی چەندین ساڵە من خەون و وەهم و

پرسیار دەچنمەوە، جوانییەک نەماوە وەهمێکی لێ دروست نەکەم بەڵام کەی شاعیر لە بەرابەر قووڵایی کەوندا دەتوانێ پەی بە جوانی ببات، بۆیە شیعر عومری دەوێ داوای فەنابوونی خۆتت لێ دەکات.

منیش قبووڵم کردووە بۆیە شیعر لە دەرەوەی تایبەتمەندییەکان دەژی ئەشقیاییێکی عەجیبە، ناتوانێ لەناو تاقە مێرگێکدا بژیت، ناتوانێ لە ئاوێک بخواتەوە، بۆیە شاعیری ڕاستەقینە هەمیشە تایبەتمەندییەکان پەرش و بڵاوە دەکات و لەیەک کاتدا لەناو هەزاران دێڕ دژ بە یەک دەژێت و زەینی خۆ تژی هەرا دەکات، هەرایەک تا ئەبەد مەستانە.

٣٨

لە مەزامیرەکانی داود، مەغزایەک هەیە، ئەنگیزەیەک هەیە بۆ مردن، بەڵام بەوردی بۆی بچین هەموو ئەنگیزەکانی مردن بۆ بەتاڵکردنی چەمکی مەرگە بەوەی کە ئاو لەبەرابەریدا بوەستێ.

تائێستا من نەمتوانیوە بڵێم بۆ شیعر دەنووسم، نەمخوێندۆتەوە کەسێک گوتبێتی بۆ شیعر دەنووسم، ئەگەر هەشبووبێ ڕازی نەکردووم، شیعر وەک ئەو ئاوە وایە کە لە هەندێ کەلێنی بەردیندا دێتە خوارەوە و سەرچاوەشی دیار نییە، دەکرێ تا ڕادەی مەرگ شیعری هەڵگری گەمە جوانەکانی منداڵیی بێ، هەڵگری کۆمەڵێ هەوڵ بێ بۆ گەڕانەوە بۆ ناو سەرەتایەک هێشتان وجود و سیما و ڕوخساری دیار نەبووبێ، بەتەنیا نووسینی شیعر ورد و خاشکردنی بەرائەتە.

وەک گوتم شیعر مەبەستێک نییە دایبڕێژین، کە کەوتە سەر کاغەز هولامییەتێک دەخوڵقێنێ، بەرەو منداڵیت دەبات، بەڵام لە بازاڕەکانی گەورەییدا ڕۆحی خۆت بەسەر تاخچەکانەوە دەبینی، چەشنی سێو سوور دەچێتەوە، بۆشاییێکی گەورە دەکەوێتە میانی شیعر و منداڵێتی، جەستە و ڕۆح، شیعر لەناو هەمان ئەو بۆشاییەدا جوانی دەخوڵقێنێ، (ئیلیەت) لە کتێبی (سوودی شیعر و سوودی ڕەخنە) شیعر نانووسێ، بەڵام تەواو وەڵامی سەرسامییەکانی دەداتەوە، هێشتاکەش جێگەی گومانە وەڵام بێت، شاعیر بوون و دڵەڕاوکێ و نیگەرانی لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ تا پای مەرگ لێیان جیا نابێتەوە، بەڵام هەرگیز ئاوڕیان لێناداتەوە وەک ئەوەیە کە باس



لە دڵەڕاوکێ بکات بەڵام، سەیری ناوەرۆکی دڵەڕاوکێیەکانی خۆی دەکات، چونکە شاعیر ئەگەر بزانێ دڵەڕاوکێ چییە پێویست بەوە ناکات بینووسێتەوە جوانی شیعر لە نادیاری سیماکانی دایە، لە بێ سەرچاوەیی دایە لەمەدا هەموو ستایلەکانی ئەدەب یەکن بۆنموونە کە (گابریل مارگیز) (سەد ساڵ تەنیایی) نووسی بەسەرە قەڵەمێکی بچووک دەستی پێ کرد کە نەیزانی ئەم سەرەقەڵەمە چ هەرایەکی نایەوە، لە ناو ڕۆمانەکەیدا (سیلونە) لە (شارە نادیارەکانی)دا وەهمی کەسێکی دەنووسییەوە پاشان دەرکەوت هەموو ئەو وەهمانە هی خودی خۆی بوون، (پاپلۆ نیرۆدا) شیعری دەنووسی، بەڵام خاڵی بوون لە وەهم و دڵەڕاوکێ، (سەعدی یووسف) شیعر دەنووسێ، بەڵام خاڵییە لە وەهم، هەرواش (عەبدوڵڵا پەشێو) شیعر دەنووسێ بەڵام خاڵییە لە وەهم. ئەمانە جۆرە گوتارێکی دیکەن لەشیعر نزیک دەکەونەوە لەگەڵ گوتاری ڕەخنە، دیوارێکی تەنکیان لەمیانە، لە بەرداشی کۆتاییدا وەهم و بەرائەتی منداڵی یەکن. دوو دەستە خوشکی بوخچە نەکراوەی شیعرن.

٣٩

کە گوتمان شیعر یانی خۆداماڵین لە هەموو شرۆشیتاڵی واقیع. دەرباز بوون لە شووشەی واقیع، ورد و خاشکردنی واقیع، لای ئێمە تەوژمی سەلەفی گوتاری ڕەخنە لەوەدایە لەناو واقیع بژی و واقیع لای ئەوان پیرۆزە، هیچ واقیعێکی شیعری پیرۆز نییە، هەموو واقعیەتێکی شیعری، زیندانێکی گەورە، بۆ هەموو ئەو موفرەداتانەی شیعری نایاب دەخوڵقێنن، دواکەوتنی شاکاری گەورە لە شیعری کوردی لەسەر ئەوە هات کە یەک چارەگە سەدە شیعری واقیعی نووسرایەوە پێمان وابوو بەو دروشمانە دەتوانین نەوەیەک ڕزگار کەین، بەڵام دەبوایە بیر لەوە بکەینەوە کە جوانترین ڕزگارکەری نەوە، ئەو شیعرەیە کە لە ناو نەقاوەتی وشەدا ئاسۆکان ڕوون کەیتەوە، ئاستی داهێنان بەدەرخەین هەر کاتێ توانیمان لە پرۆسێسی داهێنان لەمپەری واقیعەکان ببەزێنین، سنووری داهێنان بەدیار دەخەین و هەمان ئەو ئێرڤانایەی تۆ باسی دەکەیت کە من بە (الصفاء و المطلق) تێی دەگەم دروست دەبێت واقیع ژاوە ژاوە گەورەیە، مرۆڤایەتی خەبات دەکات لەو ژاوە ژاوە ڕزگاری بێت چۆن دەبێت ئێمە لەناو شیعردا زیندووی بکەینەوە، ئێرڤانا خەسڵەتی سۆفیگەرانەیە، بۆیە لەواقیع

ڕایان دەکرد و دەچوونە ناو خەڵوەتەوە، بەمەبەستی گەیشتن بەخوداوەند کە هێمنییێکی ڕۆحییان پێ ببەخشێ.

٤٠

هەر کەسێ بزانێ نهێنی دەقی زیندوو لەچیدایە ناکەوێتە سەر شیعر نووسین، وەک گوتم شیعر بەوە مرۆڤ دەهەژێنێ و تا دواساتەکانی ژیان خەریکی دەکات کە ناتوانێ نهێنییەکانی بدۆزێتەوە، شیعر تەلسمێکە کە کردتەوە، چەمکەکانی بەتاڵ دەبن، (نالی) دەزانێ هەوری ئاسمان چییە، پێوەندی نێوان هەور و خەمناکی چییە، کە هاتووە کەشفی ئەمە بکات، بەڵام جۆرێک تەجەلیات دەبەخشێ و هەر دەکاتە شتێکی دیکە.

(ئاسمان هەورین دەبێ، ئێمەش بەغەمگینی دەڵێین: ئەی خودا چ بکەین لەناو ئەم کاولەی کەس نەماوە) پرسیارێکی ئەزەلی ئینسانە لە هەور و ئاسمان و غەمگینی.

٤١

کلتووری نەتەوایەتی هەڵگری بابەتگەلێکی زۆرە هەر لە خووڕەوشتی تاک تا دەگاتە دوا بەرهەمەکانی زانستی و سۆسیۆلۆژی و مێژوویی... تاد هەموو ئەو شتانە پێی دەڵێن کلتووری نەتەوە، شیعر بەچاک و خراپییەوە دەبێتە بەشێک لە کلتووری نەتەوە، لەناو کلتووردا هەموو بەرهەمەکان یەکسانن، پێوەری چاک و خراپیان، ڕۆڵی کاریگەریان، بەرزی و نزمییان، دەچێتە ناو گوتاری ڕەخنە، کە ئەوەش بەشێکی کلتووری نەتەوەیە، ناتوانین (ئەرستوڤانیس) لەناو کلتووری گریکدا جیا بکەینەوە لە (سۆفۆکلیس) هەرواش ناتوانین لەناو کلتووری نەتەوەیی کوردیدا، (حەریق) جیا کەینەوە لە (جەزیری) هەموویان کلتووری نەتەوەن، دەستنیشان کردنی شوێن و پایەی ئەوانە ئەرکی گوتاری ڕەخنەیە مەبەستم ئەوەی لەناو کەوانەی کلتووری نەتەوەیی شوێنێک لە شوێنێکی دی بەرزتر نییە، هەمووی کلتوورن، بەڵام جیابەند کردنی ئەمە ئەرکێکی دیکەی بەشێکی دیکەی کلتوورە، شیعر بەتەنیا کلتووری نەتەوە دروست ناکات بەڵکو هەموو بابەتەکانی دیکە بەیەکەوە کلتوور دروست دەکەن.



٤٢

هەڵسەنگاندنی بەرهەمی نەوەیەک، وەک ئەوە وایە باس لە دەریا بکەیت کە بە هەزاران هەزار ڕووبارو جۆگەلەی لێ بۆتەوە، بۆیە تەقیم کردنی بەرهەمی نەوەیەک هەروا کارێکی ئاسان نییە، چونکە لە پشتی خۆیانەوە کۆمەڵێک هۆکارو دەرەنجامیان هەڵگرتووە، بە کۆمەڵێک داوی مێژوویی دووراوەتەوە، بە کۆمەڵێ تەقەڵی سیاسی تانوپۆ بووە، بەڵام وەک گۆشەنیگاییێکی لەدەرەوە دەکرێ بڵێم شیعری نەوەی ئێمە ئاسۆیەکی نادیاری نەتەوەیی سووری کردبوو، دێڕەکانیان هەڵگری ترس و دڵەڕاوکێ بوون، فۆرمەکانیان لەدایکبووی ناچاری بوون، بەگشتی شیعری نەوەی من شیعری دوای شکستێکی ڕۆحی گەورە بوو، کە هەموو بنەماکانی ژیانی وردو خاش کرد بوو. ناکرێ نەوەیەک هەبوو بێ شتێکی بۆ بەر لە خۆی نەکربێ، من پێم وایە هەموو نەوەیەکی تازە داهێنانێکی زیادی هەبووە لە نەوەی پێش خۆی چ لەڕووی تێڕامان چ لەڕووی فۆرم، چونکە ئیقاعی ژیان دەگۆڕێ کە نەوەیەک دەڕوا و نەوەیەکی دیکە دێتە پێشەوە.

٤٣

سەبارەت بەم باسە دەبێ جیاوازی بکەین لە میانی قۆناغی شیعرو ڕەوتی ڕەخنە، بەرهەمی شیعری نابێتە سەرچاوەیەک بۆ ئەوەی هەمیشە بگەڕێیتەوە سەری سوودی لێ وەرگریت، تەنیا بۆ خوێندنەوەو چێژ لێوەرگرتنە، بەڵام دەکرێ مرۆڤ بگەڕێتەوە سەر تەنزیری ڕەخنەیی و سوود لە لێکدانەوەکانی وەرگرێت بەداخەوە ئێمەی کورد بەرهەمێکی ئەوتۆی گوتاری ڕەخنەیی شیعرمان لەناو کلتووری خۆمان دەست ناکەوێ تا وەکو سەرچاوەیەک بگەڕێینەوە سەری لەگەڵ ئێستای گوتارەکاندا لێکی بدەینەوەو بەراوردیان بکەین و بایەخیان لێ وەرگرین، ئەوەیان دەگمەنە، بەڵام من خۆم زۆر جاران بەڵکو هەمیشە دەگەڕێمەوە سەر بەرهەمی شیعری کلاسیک و دەیانخوێنمەوە. ڕەنگە لەناو داوە دوورەکانی زەیندا کاریگەرییان بمێنێ و بێ ئیرادە تێکەڵ بە بەرهەمی شیعری تازەی خۆمیان بکەم، بەڵام سەرچاوە نین.

٤٤

شیعر نیشتمانێکی تایبەتی شاعیرە، زۆر شاعیری بێ نیشتمان لەناو نیشتمانی تایبەتی شیعری خۆیاندا ژیان و مردن، بەڵام هەمیشە و تا ئەبەد نیشتمانی ڕاستەقینەی شاعیر خاکەکەیەتی کە بۆن و بەرامەی دەچێتەوە ناو ڕەگی شیعرەکانیەوە، هەموو شیعرەکانی گۆرانی بۆ نیشتمان دەچڕن، بەڵام بەشێوازو ناوەرۆکی جۆراوجۆر، من کە بەسەر تەونی بەرێکەوە ڕامانێ بۆ جوانی دەچنم، نیشتمانی خۆم دەدوێنم، کە باس لە وەرگەڕانی ڕۆحی مرۆڤێک دەکەم گوزارشت لە باخێکی نیشتمان دەکەم. هەر خۆی چنینەوەی داهێنان و پێشکێشکردنی شاکارێکی شیعری با بەسەر لێواری نەرسۆسیەتیش بێت گەورەترین ڕۆحی نیشتمانییە، (لۆرانس) کە (ژنانی عاشق)ی نووسی پێوەندی بە گۆرانی گوتن نییە بۆ نیشتمان، بەڵام گەورەترین نیشتمانپەروەرێتی مومارەسە کردووە بەوەی ئەو داهێنانە گەورەیەی داوەتە وڵاتی خۆی هەرواش (دانتی) لە شاکارەکانی خۆیدا کازانزاکی (زۆربای) نووسی، بەڵام نیشتمانی خۆی زیندوو ڕاگرت بەو بەرهەمە، نیشتمانپەروەری شاعیران و ئەدیبان لەوەدایە شاکاری گەورە گەورە بۆ نەتەوەکان جێ بهێڵن، مەبەستم ئەوەیە بڵێم داهێنان کارێکە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی، تایبەت نییە بەجوگرافیاییەکی دەستنیشانکراوە.

٤٥

ناکرێ بڵێین ئەرکی زمان لە شیعردا چییە، چونکە شیعر واتە زمان، زمان لە شیعر دابڕێ شتێ نامێنێتەوە بڵێین چۆن زمانێکی دەبێ لە شیعردا هەبێت، پێم وایە هەندێ جار بەزمانێکی سادە شاکارێکی گەورەی شیعری دروست دەبێ، هەندێ جاریش بەزمانێکی قورس و تۆکمە جۆرە شاکارێکی دیکەی شیعر خەڵق دەبێ، زمانی (سەعدوڵڵا پەرۆش و لەتیف هەڵمەت و عەبدوڵڵا پەشێو) زمانی سادەن، بەڵام شیعری نایابیان خوڵقاند، هەرواش زمانی (شێرکۆ بێکەس و ڕەفیق سابیرو ئەنوەر قادر محەمەد) زمانێکی قورسترە، بەڵام بەرهەمکی نایابیشیان خوڵقاندووە. زمان بۆ شیعرو خوڵقاندنی کاریگەری چ سادەو چ قورس وەستایی و کارامەیی دەوێت، زمان



پێویستی بەشێلانێکی عەجیب هەیە لەناو شیعردا، واتە گەمە کردن بەزمان، دروستکردنی مانا قووڵەکان بە وشە، خەڵقکردنی کاریگەرێتی لە ڕێگەی موفرەدە پێویستییان بەئەشق و ڕۆشنبیری هەیە.

٤٦

لەراستیدا من پێم وانییە شیعری تاراوگە بە مانای ڕاستەقینەی خۆی تائێستا لە ئەدەبی کوردیدا سەری هەڵدابێ، حەزدەکەم ئەوە بزانی کاتێک شیعری تاراوگە دروست دەبێ، کە شاعیرێکی کورد کەوتبێتە وڵاتێکی غەریبی و ئیدی دەرگای لەسەر داخراو بێت و ببڕای بڕای نەتوانێ بگەڕێتەوە وڵاتەکەی خۆی، بەڵام زۆربەی شاعیرەکانی ئێمە کە چوونەتە دەرەوە، هەمیشە کەم تا زۆر ڕێگەیان هەبووە بێنەوە وڵاتی خۆیان. شاعیر لە تاراوگە بۆیە دەتوانێ شیعری تاراوگەیی بنووسێت ئومێد بڕاو بێ لەگەڕانەوە، تا دێت نیشتمان لەناو خوێن و ڕۆحیدا گەورە دەبێ، بەڵام لە هەمان کاتدا بە حوکمی زەمانە و زاکیرە تا دێت سیماکانی لەبەرچاو کاڵ دەبنەوەو گۆڕانەکان چاوی دەگۆڕن ئیدی شیعر دەکاتە بەدیلێکی ڕاستەقینەی نیشتمانی خۆی، لەو کاتانەدا شیعری تاراوگە سیما و خەسڵەتی خۆی هەڵدەگرێ و جیاواز دەبێ لەگەڵ شیعری ناو نیشتمان، بەڵام بە بەراوردکردنی بەرهەمی شیعری شاعیرانی دەرەوە و ناوەوە تا ئێستا هیچ جیاوازییەک نابینم، بەڵام شتێکی دیکە هەیە زۆر بەرهەمی ناوەوە دەخوێنمەوە زیاتر بوونی غوربەتیان لێ دەکەم، شاعیر وەک تاکێکی ئەو کوردە لەبەر باری ئاڵۆزی ژیانی نەتەوەکەی هەمیشە جۆرێک لە غوربەتی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە هەمان ئەو دوو نموونەیە دەتوانم بڵێم خەسڵەتی شیعری تاراوگەیان تاڕادەیەک لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرتووە، دیارە نەگەڕانەوە بۆ نیشتمان، نەگەڕانەوەی ئەبەدی و قەناعەتکردن بەوەی کە تازە گەڕانەوە نەما شیعری تاراوگە دروست دەکەن.

٤٧

هەموو نەوەیێکی ئەدەبی پەروەردەی کۆمەڵێک مەرجەعییەت و کۆمەڵێک کەناڵی ڕۆشنبیرییە، کە ئەدەبی بێگانەش هەمان ئەو مەرجەعییەت و کەناڵە ڕۆشنبیرییە، ناکرێ ئەوەیێک بێ هیچ بنەمایێکی ڕۆشنبیر سەرهەڵدات یان سوود لە ئەزموونی ئەوانەی پێش خۆی وەرنەگرێ، (گۆران) لە شیعرەکانی سەر بەرێچکەی ناتورالیزمدا

شیعری نایابی نووسیوە و خودانی فانتازیاییکی گەورەیە (ترۆپکی خەیاڵ) بەعەشقەوە شیعری نووسیوە. ناکرێ کاریگەر نەبێ، هەرواش (روانگە) بزاوتێکی ئەدەبی بوو، ئەگەر چی ڕەونەقی سیاسی هەبوو، بەڵام کاریگەری خۆی هەبوو. نەوەی ئێمە نەوەیێکی پڕ جونب و جۆش بوو، هەڵگری شوناسێکی ڕۆشنبیری بوو، عاشقی خوێندنەوە بوون، هیچ یەک لە نەوەی شیعری ئێمە بەبێ خوێندنەوەی کلاسیک نەبووە هەموویان کلاسیکی کوردی و بێگانەیان خوێندۆتەوە.

نوێبەخشی ئەنجامی گەلاڵە بوونی کۆمەڵێک ئەزموونی خوێندنەوەیە، ڕسکانی ئەزموونی خوێندنەوەیە، ڕسکانی ئەزموونی شاعیر لەو بەردەوام گەڕانەیە بەدوای گەوهەرەکانی ئەدەب و ڕۆشنبیری، زمان گرینگە بۆ بەرهەمهێنانی داهێنانێکی پڕ لە بیرۆکەی تازەو هاوچەرخ و نوێبەخشی، تەنانەت زۆر لە پێگە ڕەخنەییەکان لەسەر بنەمای زمان دامەزراوە و کاردەکەن، بونیاتگەری بایەخێکی گرینگ بە بونیاتی زمانی شیعر دەدات.

٤٨

بەپێچەوانەوە ڕۆمان و خوێندنەوەی ڕۆمان باخچەکانی شیعر سەوزتر دەکەن، کرێشمە و ڕامانی شاعیران پڕ تر دەکەن، ڕۆمان سەرچاوەیێکی گرینگی خەیاڵ پەردازی شاعیرانە، هیچ ژانرێکی ئەدەبی ژانرێکی دیکەی ئەدەبی داناپۆشێ هەریەکەو هێڵی زەینی خۆی هەیە، من بۆ خۆم ئەوەندەی ڕۆمان دەخوێنمەوە ئەوەندە شیعر ناخوێنمەوە، دیارە شیعر بۆ لە کوردستان دیاردەیێکی جیایە لەگەڵ باقی ژانرەکانی دیکە، ئێمە میللەتێکی ژێر دەستەی داگیرکەران بووینە، شیعر تاکە هۆیەک بووە لەگەڵ خۆمان هەڵمانگرتووە، دڵی خۆمان پێداوەتەوە، وەڵامدانەوەیێکی خێراو نهێنێ ڕۆحی شکاومان بووە، پاشان لەو سەردەمانەدا تا چاو هەتەری دەکرد چۆڵایی بووە، هۆکارەکانی ژیاری لە کوردستاندا نەبووە، کارگەی نەبووە، سینەماو دارستانی گەورەو مەلەوانگەو هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ خەریک دەکەن نەبووینە.

جگە لە شیعر شتێکی دیکە لە ڕۆمان و مۆسیقا و دراما و بەرهەمەکانی دیکە لە ئارادا نەبوونە. بۆیە شیعر لە بەرایی هەمووان بووە، بەڵام ئەمڕۆکە وانییە گەنجەکانمان بەرەو دنیای زانست دەچن لە کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و باقی زانستەکانی دیکە، بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە کە شیعر پاشەکشێ بکات.



٤٩

من باوەڕم بەوە نییە کە ڕۆژنامەکان بتوانن داهێنەرێک دروست بکەن، ڕەنگە بە خەڵکی بناسێنن، بەڵام هەرگیز ناتوانن وەک داهێنەر دروستی بکەن هەموو داهێنەرە گەورەکانیش لە تەنیاییدا کاری داهێنان ئامێزانەی خۆیان ئەنجام داوە، بەڵێ ڕۆژنامە بەرهەمەکان بڵاودەکاتەوە ڕۆڵی خۆی هەیە لە گەیاندنی بەرهەمی شیعری شاعیران بەخوێنەران تەنیا کاری ڕۆژنامە گەیاندنی بەرهەمە نەک دروستکردنی داهێنەر.

٥٠

بیروباوەڕێکی کۆنینە هەیە کە بەشێوەیەک پێناسەی ڕەخنە دەکات کە گوایە هەوڵێکە بۆ بەدواداچوونی دەقێکی ئەدەبی و ڕۆشنبیری، هەروا بەدیارخستنی لایەنی خراپ و چاک، ئەمە بۆچوونێکی زۆر سەقەتی تەوژمی سەلەفییەتە، چونکە ڕەخنە جۆرێک داهێنانکاری دیکەیە، گوتارێکە هەڵگری کۆمەڵێک کەشف و خەستبوونەوەیە بەسەر دنیا شاردراوەکانی ناو دەق، دەبێ گوتاری ڕەخنە گوتارێکی داهێنان ئامێزبێ، وەک چۆن دەقێکی شیعری دەخوێنینەوە و ڕامان دەکێشێتە ناو کۆمەڵێک ڕامان و لێوردبوونەوە ئاواش دەبێ ڕەخنە بخوێندرێتەوە، ڕەخنە ڕووبەرێکی فراوانی هەیەو بابەتی زۆری هەیە، هەر لە حەفتاکانەوە تا کۆتایی هەشتاکان ڕەخنە لەناو جغزێکی تەسکدا بوو، بەڵام لەدوای هەشتاکانەوە ڕەخنە بە ئاراستەیێکی دیکەی فیکری و لێکۆڵینەوەدا چوو، کۆمەڵێک گەنج توانییان بنەمایێکی باشی ڕەخنە دابمەزرێنن وەک پرۆژەیێکی گرنگی ناو ئەدەبیات.

٥١

وەکو گوتم کلتوور سەرجەمی بەرهەمی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و سیاسی و کۆمەلایەتی میللەتانە کە تۆ مەبەستت لێرەدا ئەفسانە و سیحر و بابەتەکانی دیکەی ناو داستانە. من لە سەرەتادا بایەخم لەو ژانرە دێرینانە وەرگرتووە وەکو ماسک و ڕەمز بەکارم هێناون بەتایبەت لە دیوانی دووەمم (تەمە سپییەکانی ڕۆح)، بەڵام ئەمە قۆناغێک بوو ئیدی لەدوای ئەمە کۆتایی هات، لەمەڕ بە گومان کردنی کلتووری

یەقین، تەنیا دەتوانم ئەوەندە بڵێم لەناو شیعرە دا یەقین بوونی نییە تا یەقینبەستەکان بەکاربهێنم، بۆیە سەرەتای شیعر گومان بووە لەبەرابەر کەون ئەگەر وەک دیدگاییێکی فەلسەفی شیعری بۆی بچین، جیهانبینی شاعیرانی هاوچەرخ تژی گومانە لەهەموو دیاردەکان، گومانی شاعیران بۆ دۆزینەوەی ئاقیقی داهێنانە لەناو دنیاییێکی لێڵاویدا، ژیان لەناو یەقیندا گوزەر ناکەن. هێزو برستی ئەدەب و داهێنان لەسەفەریەتی بۆ دۆزینەوەی گەوهەرە شاردراوەکانی ناو گومان.

٥٢

هەر کاتێ شیعرێکی دەنووسم. من بۆ خۆم وام دەمەوێ هەرچی هێزو برستم هەیە لەو شیعرەدا بەخەرجی بدەم، شیعر دیوار هەڵچنین نییە بڵێی ئیمڕۆ چەند ڕیزێکی دەکەم و بەیانیش باقییەکەی، شیعر حاڵەتێکی غەیبییە هەندێ جار لەناو خوێنت بەرجەستە دەبێت و لەگەڵت دەکەوێتە کێشەوە، ئەو دەم کوڵی دڵی بۆ هەڵنەڕێژی ئیدی دەڕواو بەسەر دەچێ، جا لەبەر ئەوە دوای نووسینی شیعرێک ئەو گومانە لای من دروست نابێ چونکە دەزانم شەیتانی ئەو شیعرە لە هەندێ ساتی دیکە خۆم پێ نیشان دەداتەوە و گەفم لێ دەکات، هەر بۆیەش دینامیکییەتی شیعر نووسین جاویدانییە جاری وا هەیە مەودای نێوان شیعرێکی و نووسینی شیعرێکی دیکە چەند ساتێکە، هەندێ جاریش هەیە ساڵێکە. هەندێ لە ساتێکی دەست پێ دەکات تا چەند سات و سات بەردەوام دەبێ، لەمیانی ئەو ماوەیەدا، شاعیر لەناو سەرخۆشییێکی سەیردا دەژێت.

٥٣

من پێم وایە ڕاستگۆیی لە شیعردا هیچ چەمکێکی نییە، شیعر خۆی حاڵەتێکە لەپشتی واقیعەوە، لە پشتی ڕاستگۆییە، هەر کاتێک شاعیر بیەوێ ڕەگەزەکانی ڕاستگۆیی بخاتە ناو شیعر، دەبێتە کەسێک کە وەعز بنووسێت و خەڵک بە پەند و عیبرەت گۆش بکات. لە سەرەتاوە گوتم شیعر وەهمێکە لە وەهمە جوانەکان کە شاعیر تەسەللای دڵی خۆی پێ دەکات، من ناڵێم ئەدەب درۆیەکی جوانە، دەڵێم وەهمێکی جوانە لای شاعیر ئەو وەهمەش حەقیقەتە، گومانە.



٥٤

پێشتر باسم کرد کە شیعر کات و ساتی تایبەتی خۆی هەیە کاتێک بیرۆکەی شیعر لەناو کرێشمە و ڕامانی شاعیر دەڕسکێ، خودی شاعیر گۆڕانێکی عەجیبی لێ بەدەردەکەوێ، بەشێوەیێکی کە دادەبڕێ لە هەموو شتێک. شێوەی هەڵڕژانی ئەو بیرۆکەیە وەسف ناکرێ، بۆیە تائێستا نەزانراوە چییە ئەم عەوداڵییە بەدوای داڕشتنی شیعرێ، یان شیعر چ پارسەنگێکی بابەتی بۆ ژیان دروست دەکات، هەر ئەوەشە وا دەکات پرۆسێسی شیعر نووسین شیعر وەک تەقینەوە وایە کە ئاگرەکەی هەڵچوو ئیدی بورکانێکە و کات و ساتی دیاریکراوی نییە، باوەڕیشم بەوە هەیە کە ئیلهام لەناو هەموو مرۆڤێکدا هەیە، بەڵام پێویستی بەدەستێکی کارامە هەیە بیشێلی و گەوهەرەکانی بدۆزێتەوە.

٥٥

ئەگەر شیعر (حەز بوایە) دەچووە ژێر باری یاسای (المنفعە الحدیە) واتە کە سێوی یەکەم دەخۆی تام و چێژێکی زۆری هەیە، کە هی دووەم دەخۆی تام و چێژی کەمتر دەبێتەوە، کە هی سێیەم دەخۆیت هەر زۆر کەم دەبێتەوە تا وای لێ دێت هەر تامی نامێنی، بۆیە شیعر پەیوەست نییە بە ئارەزووی مرۆڤ و حەزەکانی، شیعر وەڵامدانەوەییێکی کپی هەموو ئەو هاوارانەیە کە لە جوگرافیاییێکی دووری ناو زەین و جەستەی مرۆڤەوە هەڵدەکات داوای ڕاکردن و سەرهەڵگەڕان و چوونە ناو نادیارەکانت لێ دەکات، هاوارێکە تاوەکو ئێستا شاعیران نەیانتوانیوە لە کوێوەوە دێت و چۆن هەڵدەکات. منیش هۆگری ئەو هاوارە نادیارە بوویمە بۆیە زۆر جاران هەست دەکەم من دەگەڕێمەوە سەر ڕەگەزی با و باران و لە سولالەی پاسارییەکانم.

٥٦

لە ڕاستی وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێ ئەوانە بیدەنەوە کە بەکاری ڕەخنەوە خەریکن، من خۆم ناتوانم بیسەلمێنم کە کاریگەریم هەبووە یان نا، بڵێم هەیتم ڕەنگە خۆم ڕازی نەبم بۆیە ئەمە بۆ ڕەخنەگرەکان بەجێ دەهێڵم.

# بەشی حەوتەم

## ئەمیرە شکست خواردووەکانی شیعر

لە وەڵامی نامەی کەسێکدا

من بۆ خۆم نە باوەڕم بە ئەمیری شیعر و مەلیکی شیعر و شای شیعر و ئەباتیرەی شیعر هەیە، نە باوەڕیشم بە لووتکە و ترۆپک و گردۆڵکەی شیعر هەیە، تاکە شتێ کە لە شیعردا بیزانم شیعری ساغ و شیعری نەخۆش هەیە چونکە پێم وایە نوێترین و جەوهەردارترین شیعر، نوێتر و تۆکمەتر و جەوهەردارتری بەدواوە دێ.

هەر کاتێک باوەڕمان بەو گۆکارییە نەرگزگەراییانەی شیعر هەبێ ئەوا دیارە سەر چاخی جاهیلییەت و نوشتەکاری شیعری هەر ماوە و بەسەر نەچووە، چونکە مێژووی شیعر ئەو ناوە بریقەدارانەی شیعر و شاعیرانی ئەرشیف کردووە، ئاسۆی شیعریش زۆر لەو شاهنشاهانەی شیعری بینیوە کە چۆن وەک گەڵای دار وشکیان کردووەو هەڵوەریون.

شیعر بەردەوامی و شەونخوونی دەوێ لەگەڵ کتێبان، بەهرەی شیعری بەردەوامی دەوێ لەگەڵ داهاتە تازەکانی ناو پانتایی ڕۆشەنبیری و کارێک نییە وەک میتۆد بۆی هەوڵ دەی و باوەڕنامەی ناوداری لێوەربگریی و ئیدی پشتی لێبکەی. شیعر بۆ شاعیر هەبوویێکی ڕانەگیر و دەستگیر نەکراوە، تا کۆتایی عومر دەبێ بەدوا یدا بگەڕێی، لەناو پێرستی شاعیراندا ناوی گەورەو کاریگەر هەبوون، ڕۆڵی گەورەیان بینیوە لە مشتومالکردنی پرۆسێسی شیعر بەڵام چونکە پێیان وابوو شەهادەی شیعریان وەرگرتووە ئیدی بۆیان هەیە بێن بە سەرەک کۆماری شیعر و بە پێی میزاجی خۆیان پارێزگا و ئیمارات و گوندی شیعری بۆ ئەوانی دی بڕیار بفەرموون، سەلاحیەتی تەواویان هەیە خەتی چەپ و ڕاست دوور لە هەموو جەمالیاتێکی ویژدانی بەسەر ئەوانی دیکەدا بهێنن و خەڵکیش دەبێ گوێیان بۆ شل کات، هەر





بۆیەش لە نیوەڕێی ئەم سەفەرە سەختە کوژانەوە و هیچیان لە بار نەما، بۆیە دوای کوژانەوەیان کە دەربارەی شیعر و شاعیری دەپەیڤن پیاو حەز دەکا پێیان بڵێ ئەوانە ڕێزی بەرهەمەکانی ڕابردووی خۆشیان ناگرن و لەکەداری دەکەن و تەڕ و وشکی خۆیان پێکەوە دەسووتێنن، دەخوازم بڵێم: ئەوانە مافی خۆیانە بۆ خۆیان و خزمەت بەخۆیان هەر چییەک بێژن، بەڵام کار بگاتە ئەوە ئەمیراتی خۆیان ئەزەلبەندی بکەن و هیچ داهێنانێکی تازەشیان پێ نەبێ، ئەوە قسەکانیان دەکەن بەو ڕەشە بایەی کە خۆڵەمێشی خۆیان پەرش و بڵاوی ناو دڕک و داڵ بکەن.

هەموو ئیمپراتۆرەکانی شیعر شکستیان هێناوە تەنیا شیعر ماوە، بە ئەزەلبەندی کردنی خۆیان قەبەترین پاڵتۆی سەلەفییەت لەبەردەکەن، چونکە وەکو ئەوە وایە کە بڵێین دەقانووس ماوە، بەڵام کە دەچنە ناو شارە تازەکانی شیعر ئەوسا دەزانن کە ئەوان تازە لە ئەشکەوتەکان هاتوونەتەوە.

بۆیە ئەگەر ئەوانە ڕەحم بە کەس ناکەن با لانی کەم ڕەحم بە شیعری ڕابردووی خۆیان بکەن، تا بەڕێزەوە باس لە بەرهەمەکانیان بکرێت.

برایانی خۆ بە شاهەنشازانی شیعر کە تۆ باس لە مەزنی خۆت دەکەیت دەبێ ئاگاداری ئەوە بیت لەناو گیا و گوڵی درەختەکانی شیعردا سەدان دێڕی نوێبەخشیدی هەیە بەسەهووت دەبات، هەڵبەت ئەو شینە شاهۆیانەی شیعر نابێ بە سێبەری سپێدانی خۆیان هەڵخەڵەتێن، بەڵکو دەبێ بیر لە سێبەری ئێوارانی خۆشیان بکەنەوە کە ڕەنگە هەر نەیبینن.

( هەنە نازانن بەڵام دەزانن کە نازانن ئەوە گرفتە تاڵەکەیە کریف)

## بەشی هەشتەم

# خولیاکان

## شوناسی نیگەرانی ڕۆشنبیران

١

ئێمە کۆمەڵگایێکی گومانساز و عاشق بە ڕاڕایین، هەمیشە و بێ وچان جەستەیێکی والآیین بۆ ڕمو کاردی ئەو گومانە و زەینێکی کراوەین بۆ مۆرانەی ئەم ڕاڕاییە، هەربۆیەش زوو زوو دەکەوینە ژێر کاریگەرێتی وەهمی کەوتن و داڕمان، بەدرێژایی مێژوو ئەگەر هیممەتی ڕۆڵی بە تینی تاک نەبوایە ئێستا کرمی ئەو گومانە و داسی ئەم ڕاڕاییە پەلی دابووین و بە چڵەپۆپەی ونبوون و لە بیرچوونەوەی هەڵواسیبووین .

٢

فەلسەفەی کەوتن و داڕمان بۆتە کەتە گۆریای ڕۆژانەی ئێمە، بۆتە ترسێکی لەمێژینەی سەرجەم، سەرجەلەی ئەم واهیمەیە دەگەڕێتەوە بۆ مێژوویێکی دوورودرێژ، مێژوویێک تژی شکست و نەهامەتی و تژی باوەڕ بەخۆ نەبوون و تژی بە بەهێز زانین و بە زەبەلاح زانینی دوژمن، لە بەرامبەر ئەوەدا هیچ تەوژمێ نەبووە کە ببێتە هۆکاری ورد و خاشکردنی ئەم واهیمەیە جا ئەو تەوژمە چ لەسەر ئاستی بزووتنەوە سیاسی و ئایدلۆژییەکان بێ چ لەسەر ئاستی ڕۆڵی ئەنتلجینسیای کورد بێ،

٣

دەخوازم بڵێم ئێمە نەتەوەیێکی ستەمدیدەین و ئەوەندەی کارمان لەناو بە جووڵەخستنی جەستەی شۆڕشکاری کردووە ئەوەندە کارمان لە ناو زەین و



ڕۆناکبیری نەکردووە، واتە بەجەستەمان گوتووە وەرە و زەینیشمان لە دوای خۆمانەوە بەجێ هێشتووە، واتە گەمەی هیلاک کردن و شەت و پەتکردنی جەستەمان ئەنجامداوە بێ ئەوەی بەرهەمێکی گەورەی زیندووکردنەوەی زەین و هۆش بۆ نەوەکان بەجێ بهێڵین تاوەکو ئەمڕۆی گەنجەکانی پێ بەڕێوە بچێ، ئەمەش وای کردووە کەوا ڕۆحی بەربەرەکانێ و دینامیکییەتی ڕووبەڕوو بوونەوەی نەوەکان لە ئاستی هێزی مانەوە نەبێت، ئەوەندەی گوناهی ئەم غەفڵەتە دەکەوێتە ئەستۆی بزووتنەوەکان سەد ئەوەندەش دەکەوێتە سەر گەردنی ڕووناکبیر و ڕۆشنبیران .

٤

ئەگەر کاری بزووتنەوەکان موقاوەمەت بووبێ بۆ لەناو نەچوونی قەوارەی نەتەوەکەمان ئەوە کار و پڕۆژەی ڕۆشنبیران ئەوە بووە کە ئەم ئەرکە پیرۆز و چارەنووسسازە بگرنە ئەستۆ، ئەگەر سەرنج بدەین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئێستاشی لەگەڵدابێ هێزی چەک کاریگەرترە لە هێزی بیرو باوەڕو فیکرو ڕۆشنبیری، تاکی کورد وا بیر دەکاتەوە هەر کاتێ چەکی لە دەست نەما و لە هەر سات و کاتێ بێ، ئەوە ترسی ڕمان و شکستخواردن وێرانی دەکات، ئەمە داخوازی ئەوەمان لێ دەکات کە لەم دیاردەیە هەڵوەستەیەک بکەین و بەخۆمان دابچینەوە .

٥

مێژووی هەموو نەتەوەیێک بایی ئەوەندەی نەهامەتی تیایە کاردی ڕەخنە وەشانەکانی خۆی لە ناو جەستەیدا ئەنجام بدات، بەڵام مێژووی ئێمە خاڵییە لە وێناکانی ڕەخنە و فۆرمەکانی بیروبۆچوون، هەربۆیەش ئێمە نەتەوەیێکین هەتا لەو ڕەخنەیەش دەترسین کە دەمانخاتەوە سەر پێ و دروستمان دەکاتەوە تا بۆ زەمەنێکی تریش بژین، ئێمە تا ئێستاش دەرکما بەوە نەکردووە کە درەختی ڕەخنە جوانترین سیما دەبەخشێ بە کۆمەڵگا و بزاوت و ڕۆشنبیری، هێزێکی لەبن نەهاتووی کلتووری جیاوازی قبووڵکردنی یەکترییە، هێزی مانەوەی نەتەوەیە، هەموو ئەو نەتەوانەی کە ئیمڕۆکە پێشکەوتووترین نەتەوەن، ئەو نەتەوانەن کە خودانی کولتوورێکی ڕەنگاوڕەنگی ڕەخنەن .

٦

ئەوروپا بەدرێژایی چاخی بەر لە ڕۆشنگەری لەناو تایێکی ئەبەدی ئاینیدا هەموو سەرجەلەکانی ڕەخنەی لە سێبەری دەسەلاتێکی ئاسنیندا کردبوو بە تابۆ و کەس توخنی چەمکێکی ئاوا نەدەکەوت و تەواوی ڕۆناکبیران لەژێر کۆنترۆلی ئاوازێکی ئاینی گینگلّیان دەخوارد، هەربۆیەش ئەوروپا بۆ ماوەیێکی دوورو درێژ نەیتوانی ئەو ڕۆڵەی خۆی ببینێ لە مەودای سیاسی و ڕۆشنبیری، چونکە دامودەزگاکانی کەلێسا و باندە سیحرییەکانی هەموو دەرگاکانی دەنگ و ڕەنگی ڕەخنە و ڕۆحی ئەستەتیکایان لە خەڵکی داخستبوو، بەلام ڕۆشنبیران تەکانێکی ئەوتۆیان دا بە خۆ و شوناسیی هۆش و بیری خۆیان بەرز کردەوە و تەخت و تاراجی هێزی فیکری کەلێسایان تارومار کرد و هەموو بەهاکانی ڕەخنە و فیکریان گەڕاندەوە و کەوتنە سەر چاخی زێڕینی ڕۆشنگەری .

٧

ڕۆشنبیران لە کوردستان ئەو حەقیقەتە باش ناس دەکەن کە ئەمڕۆی نەتەوەکەیان بە چ هەلومەرجێکی دژوار هاتۆتە کایەوە و لە هەمان کاتدا بەچ هەلومەرجێکی دژواریشدا تێدەپەڕێ، بۆیە هەندێ جار دەکەوێتە میانی دوو بەرداشی سەختی تێڕامان و بیرکردنەوە، ئەو کاتەی کە دەیەوێ ڕەخنەی عاشق بە ڕاستییەکانی خۆی ئاڕاستەی ئەو هەلومەرجە بکات لە ناخەوە هاوارێ ڕۆحی ئاگادار دەکاتەوە و هەموو ئەو نەهامەتییەی وەبیر دێنێتەوە کە ڕابردووی ئەویان تژی یادەوەری تاڵ کردووە و ئێستای لا شیرین دەکەن، بۆیە بە ناچار جڵەوی قەڵەمەکەی دەگرێت تۆزێکی تێدا دەهێڵێتەوە، ئەمانە ئەو ڕۆشنبیرانەن کە لە سەردەمە ناخۆشەکانی خەباتی گەلی کوردا بەشی شێری ئازارەکانیان هەبووە، کاتێکیش کە قەڵەمەکەی لە جوولە دەخات و دەنگی ڕەخنەی خۆی کپ دەکات، دیسانەوە لەناخەوە ئاوازێکی خەمگین گیانی دادەگرێ بەوەی کە بۆ دەبێ وابێ. ئەمە وای کردووە جۆرێک لە دڵەڕاوکێ لای ئەم نەمەتە لە ڕۆشنبیران بێتە کایەوە کە هەم ئازار دەخوات و هەم دەتلێتەوە .



٨

بەم جۆرە ڕۆشنبر و ڕۆناکبیری کورد تاوەکو ئێستا هەڵگری شوناسێکی دیار و بەرجەستە کاری ڕەخنەیێکی جیددی نییە، تا بتوانێ ببێتە هێزێکی گەورە و دیار لە گۆڕەپانەکەدا .

واتە کاریگەر بێت بە سەر سەرجەم ئەو بڕیار و ڕووداوانەی ئەمڕۆ لە کوردستان هەن و کاری خۆیان دەکەن، ئەوەی هەیە هەڵچوونێکی ساتەوەختە و هەڵگری هێزی مانەوەی نییە، واتە هەڵچوونێکە تەنها بە هاوار و ناڵین گوزارشت لە خۆی دەکات بەبێ ئەوەی هەڵگری گوتارێکی ڕەخنەییی کاریگەر بێت و ببێتە سەرمەشقی چاولێکردن، هەڵبەت ئەم جۆرە هاتوهاوار و هەڵچوونەش لە نێو بایە توندەکانی سیاسەتی باودا گوم دەبێت و ماندووبوونێکی زۆر بۆ خاوەنەکەی جێ دەهێڵێ.

٩

هەڵبەتە جۆرێکی دیکە لە ڕۆناکبیران وەک ئەوەی کە لە فەرەنسا و شۆڕشی فەرەنسادا ڕووی دا هەوڵی ئەوە دەدەن کە ببنە ڕێبەری گەنجەکان و شۆڕشێکی تازەو پڕ لە جونبوجۆش بەرپا کەن و دەسەلاتی کوردی بەوە ڕابهێنن کە دەبێ گوێ لە داخوازییەکانی گەنجان ڕابگرن و جێبەجێکاری داواکارییەکانی ئەوان بن، ئەمەیان جاحێڵترین شێوەی خەباتکردنە لە پێناوی ئامانجە پیرۆزەکانی گەنجان، ئەگەر بێ و بە شێوازێکی مۆدێرن دوور لە هەڵپەی وردوخاشکردنی ئەو دام و دەزگایانە بێت کە لە کۆتاییدا هەر خۆیان دەبنە خاوەنی و ئەگەر وردوخاشیشیان بکەن بەناچار هەرخۆیان دەبێ بونیاتی بنێنەوە .

١٠

بەهەرحاڵ ئێستای ڕەخنەی ڕۆشنبیران وا پێ دەچێ زیاتر بەرەو شێوازی خۆپشاندانەکاندا بچێ نەک بەرەو قووڵکردنەوەی کلتوورێکی ڕەخنەییی سەراپاگیر وەک ئەوەی کە لە شۆڕشی فیکری ئەوروپیدا هاتە کایەوە و تاوەکو ئێستاش کاریگەرێتی خۆی هەر ماوە، جیاوازی ئەم شێوە خەباتە ڕەخنەییە کە خۆی لە تەدوینکردن و تۆمارکردن دەبینێتەوە لەگەڵ شێوازی پێشوو کە خۆی لە خۆپێشاندن

و هاوار دەبینێتەوە و هەندێ جاریش توندو تیژی لێ دەکەوێتەوە، ئەوەیە کە هی یەکەم ئاسەوارەکەی بۆ نەوەکانی داهاتووش دەبێتە مایەی سوودو فەرێکی زۆر و دینامیکییەتی دەبێ، بەڵام بە تێکەڵکردنی هەردوو ئەم شێوازە بە ستایلێکی هاوچەرخ و دوور لە سۆز و عاتیفە دەتوانین گۆڕانێکی چارەنووسساز لە ژیانی سیاسی نەتەوەکەمان بخوڵقێنین .



## ئەوینی یەکەمی ئەزموون

× یەکەم کتێب وەکو یەکەم ئیشق وایە کە هەرگیز ناتوانی لە کۆت و پێوەندە نادیارو لەززەتبەخشەکانی دەربازت بی، بۆیە هەمیشە وەک سەداییێکی شەرم ئامێز لە قووڵایی دیرۆکەوە هەڵدەستێ و بەناو شادەمارەکانمانا دەسوورێتەوە و لە دیدگا و جیهانبینیماندا تازەمان دەکاتەوە، هەمیشەش پرسی ئەبەدی دەخولقێنێ، پرسێک کە هەڵماندەداتە ناو تەمتومانی گومان و ناچارمان دەکات بە دوای ئەو یەقینەدا بگەڕێین کە هەرگیز نایدۆزینەوە و دەگەینە ئەو ڕاستییە کە هەمان پرۆسێسی گەڕان بە دوای ئەو بەهەشتە ونبووانە تەنها تەڵە نوورێکی غەیبییە لەناو زەینی ئێمەدا بۆتە هەوڵێکی ئیستەتیکی کە یا لە شیعر یا لە چیرۆک یا لە ژانرەکانی دیکەی ئەدەبیماندا ڕەنگ دەداتەوە.

× دوو جۆر بیرۆکە هەیە دەبێ ڕوونی کەینەوە، یەکەم کتێب کە وەک خوێنەرێکی جیدی کەوتبێتە بەردەست جیایە لەگەڵ یەکەم کتێب کە وەک هەوادارێ بەردەستت کەوتبێ کە لە هەردووکیاندا هەر یەکەم شتە بۆیەش تۆزێ لەمەدا دەوەستم واتە جیاوازی هەیە لە میانی یەکەم کتێبی ژیانی ئەدەبی و یەکەم کتێبی ژیانی ئاسایی.

× یەکەم کتێبی ژیانی ئاساییم بریتی بوو لە چیرۆکێکی درێژی (محەمە ساڵح سەعید) کە بەناوی (شمشاڵی شوان) بوو ئەگەر ناوی نووسەرەکەییم ڕاست گوتبێ لە ڕاستیدا هێندە بەو چیرۆکە کارتێکراو بووم، کە تەواوم کرد بە درێژایی شەو هەر بیرم لەو شمشاڵژەنە دەکردەوە کە چۆن سەدای شمشاڵەکەی موجیزەی شەفابەخش بوو بۆ مەعشوقە نەخۆشەکەی، هەر کاتێ تای ئەوین کچەی دادەگرت ئەو بەسەر تاوێرە بەردێکەوە دەستی دەکرد بە شمشاڵ ژەنی و ئیدی دەنگ دەڕژایە خوێنی وردە وردە چاک دەبۆوە، ئەم چیرۆکە بۆ ئەو سەردەمی من فەتحێک بوو، بریا دووبارە دەمخوێندەوە.

* بەڵام یەکەم کتێبێ کە لە ئەزموونی ئەدەبیما خوێندبێتمەوە، کتێبێ بوو لەلایەن

هونەرمەند قەرەنی جەمیل درا بە من کە بیخوێنمەوە کتێبی- لمن یطرق الاجراس- ی هیمنگوای بوو... هەڵبەتە کە وەرمگرت بیرم لەوە نەکردەوە کە تێی بگەم بەڵام زۆرم مەبەست بوو ئەو کتێبە بەو هەموو لاپەڕەیەوە بخوێنمەوە، بەهەرحاڵ خوێندنەوەی ناوەرۆکەکەی باس لە خەباتی مرۆڤ دەکا و ڕۆڵی فەرد لەنێو ئەم خەباتە، واتە ناوەرۆکێکی هیومانیسمی هەبوو... ڕاستی هیچ کاریگەرییێکی بەسەرمەوە جێ نەهێشت چیرۆکەکەی (محمد صالح سعید) گەلێک لەو زیاتر لەو ساوە لەگەڵما دەژێت تاوەکو ئێستا.

* دەمێنێتەوە ئەوەی کامە کتێب بۆتە توحفەی ناو زەینی من، هەمیشە لەناو ڕستە و دەستەواژەکانیدا دەژیم؟ ئەمەیان کارێکی ئەستەم و دژوارە، چونکە مێژووی داهێنان هێندە پڕ لە ئەزموونی بەهێزە کە مەحاڵە بەتەنها جوانییەک لەنێو ئەم مەملەکەتەدا بژیت، بەڵام ئەوەی هەمیشە و بێ وچان لەکاتی پێویست و ناپێویست، لەخەم و پێکەنین لە هەوراز ونشێودا وەکو کانیلەی ژینێ بۆی چوویمە قومێکم لێ خواردۆتەوە و حەساومەتەوە کتێبی- نالی- بووە، ئەو کتێبەی کە هەرچەند دەیخوێنمەوە پرسیاری ئەوەم لا دروست دەبێ، مەلایێک لە چوارچێوەی جوگرافیایێکی داخراو، بێ هیچ وەسیلەیێکی ژیان، کۆمەڵگایێکی نەخوێندەوار، چۆن توانیویەتی ئەم هەموو جوانییە کۆ بکاتەوە و ئەم دیدگایە بەهێزەی ڕاوکردنی جوانی لە کوێ هێناوە؟ بریا دەمزانی.



## لە سروشت و مەعریفە

سروشتدۆستی کارێک نییە حەزی مرۆڤ وەبەری هێنابێ و بەس، بەڵکو پێداویستییە فیزیولۆژییەکانی جەستە و زەین بەحەتمیەتی ڕاسپاردووە بۆ دامرکاندنەوەی کەف و کوڵ و پێداویستییەکانی و دەکرێ هەمان ئەو سروشتدۆستییە لە بەرابەری تەواوی ماناکانی ژیاندۆستی بێ، بەو پێیەی بەردەوامبوونی ژیان بەبێ بوونی سروشت دەچێتە ناو چەمکە مەحاڵەکانەوە، تاوەکو ئێستاش ئەندێشەی کەسێک ناکرێت بەبێ بوونی سروشت ژیابێ، ئەگەرچی پەیدابوون و تەنینەوەی سروشت گەمەیێکی هێجگار زۆری فەلسەفی خوڵقاند، بەڵام تاوەکو ئێستاش دوای هاتنەکایەوەی سەدان تیۆر لەم بارەیەوە هێشتاکەش مرۆڤ لەناو ڕارەوەکانی گوماندا سەیری ئەم کەون و سروشتە دەکات، ئەو گۆڕانانەی کە لەنێو ناخی سروشتدا ڕوودەدەن ڕێکوپێکترین گۆڕان بووە، کە مرۆڤ لە ژیانی ڕۆژانەی بەئەقڵ نەیتوانیوە گۆڕانەکانی خۆی وا دیسپلین بکات، لەنێو سروشتدا هەندێ جار فەلتەی گۆڕانی چاوەڕوان نەکراو هەیە، بەڵام ئێمەین کە بەوردی هاوکێشەکانی ئەو سروشتەمان نەخوێندۆتەوە، چاودێری کردنی سروشت وادەکات مەعریفەکانیش جۆراوجۆر بن، هەموو ڕەنگەکانی ئەپیستمولوژیا لە سروشتەوە مشتوماڵ کراون و بەپێی یاساکانی سروشت جەدەلی خۆیان دەکەن، بەو پێیەی سروشت یەکێکە لە هۆکارە گرنکەکانی سەرهەڵدان و بەردەوامبوونی ژیان و بە پێی میتۆدی نۆمینالیزم لە پێشەوەی هەموو چەمکەکانی دیکەدایە لە هەست و هۆشی ژیان، بۆیە دەبێ جێ بایەخی گرنگی ئێمە بێ لە ڕووی لێتوێژینەوە سەبارەت بە پەیوەندی ئەم سروشتە بە فۆرمە مەعریفییەکانەوە، بۆیە بایکۆتکردنی زەینی مرۆڤ لە ئێستەتیکای سروشت جۆرێک لە دژونی بۆ مرۆڤ دەخوڵقێنێ... هەر بۆیەش ئەفلاتوونیەت هەمیشە لەو باوەڕەدا بووە، کە هەموو توانای هزری و هەستی و تواناکانی وەرگرتن و تێگەیشتن و پێگەیشتن لە قووڵایی سروشتدا خەفە بووە، تەنانەت مەهاتما گاندی بۆ ڕزگارکردنی وڵاتەکەی هەموو

تەقەللایەکی خۆی خستە گەڕ کە سوود لە توانای ڕۆح و سروشت و ئاشتی بەخشی وەرگرێ. واتە لەسەر پرەنسیپێکی (ساتیاگراهانە) ڕۆیشت و مەبەستەکانیشی هاتە دی، هەر بۆیەش دەبینین زۆربەی هەرە زۆری قوتابخانە فەلسەفییەکانیش لە پانتایی باخچەکانەوە دیالۆگیان ئەنجام دەدا... بۆیە لێرەدا دەشێ پرسیاری ئەوە بکرێ کە پەیوەندی نێوان سروشت و مەعریفە لەچیدا بەرجەستە دەبێ و تا کوێ دەتوانێ مەعریفە گۆشی بکات و ئایا مەعریفە بەبێ بوونی سروشت سەرهەڵدەدات، یاخود کام لەم دوو چەمکە سەرچاوەی ئەوی دیکەیە؟ ئەمانە پرسیار گەلێکی گرینگن کە تاوەکو ئێستا نێوەندی لێتۆژینەوەی خۆماڵی هەوڵی نەداوە بەرەلای بکات و یا بەلایەوە بچێ، بەداخەوە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان بەزیادەڕۆییەکی تەواوەوە ئاوڕ لە بابەتگەلێ دەدەنەوە بەڵام بەکەم بایەخێکی هێجگار زۆرەوە ئەو بابەتانە باس ناکەن کە هەناو و وێڵداشی بابەتە تازەکانی ئێستان، بەو پێیەی وەک چۆن کەتەگۆریای یەکەم ڕۆمانی شوانکارەیی گریکی باسی لێوە دەکات کە سروشت نەک هەر سەرچاوەی سەرهەڵدانی مەعریفەیە بەڵکو خولقێنەری هەموو عاریفەکانیشە، بۆیە ئێمە لەنێو ئەدەبی کوردی وەک داهێنەر و شاعیر و نووسەر و چیرۆکنووسیش باسمان لەوە نەکردووە کە سروشت چ پانتاییەکی لەناو ڕۆحی دەقەکان داگرتووە لە کاتێکا فاکتەری سەرەکی هەموو دەقە داهێنراوەکانێتی... من ناچمەوە سەر باسی فەلسەفی ئەوەی کە ئەقڵ و هۆشی ڕەنگدانەوەی سروشتە یا سروشت ڕەنگدانەوەی ئەوانە... ئەمە قسەی زۆر لەسەر کراوە وە من هەرگیز لەززەتی شیعری خۆشم لێ وەرنەگرتوون... من باس لەو پارچە جوانانەی سروشت دەکەم کە لە دەرەوەی فەلسەفەدا کاریان لەناو ئینسان کردووە و چۆن چۆنی سروشت خۆی بۆتە هاندرو هانپێدراوی ئینسان لە کردارو ڕەفتارو سیمای نووسینەکانیاندا... ئێمە ناکرێ پەیوەندی نێوان سروشت و مەعریفە بە فەلسەفەوە شەتەک بدەین بەڵکو ئەو پەیوەندییە پەیوەندییێکی ئێستەتیکی زۆر بەهێزترە و خوڵقێنەری جوانییە زیاتر لەوەی کە خولقێنەری دەقە فەلسەفیەکان بێ، چونکە بەبێ بوونی پەیوەندی نێوان سروشت و مەعریفە جوانی لەدایک نابێت بەڵکو دەبینە خاوەن کتێبە وشکەکان، ئەو کتێبانەی لەوەتەی هەن هەناومان هەڵدەکوڵن و زەینمان ڕادەماڵن بێ ئەوەی



بابەتگەلێکمان پێ ببەخشن لەدواجار لەزۆر ڕووی دەروونییەوە نا ئومێد و سارد و سڕمان دەکەن و ژیانمان لەبەرچاو تەنگ دەکەن و دەمانخەنەوە ناو تارماییەکانی شوێنهاوەر و تووشی شەڕە مێروولەکانمان دەکەن، بەوەی کە ئێمە هەموو وەک مێروولەی باڵدار لەیەک گیر دەبین و هەندێکمان لای سەر و هەندێکیش لای دواوەی یەکتر دەخۆین و لەدواجاردا یەکتر تەواو دەکەین و بوونێکمان بۆ نامێنێتەوە، ئەمەش لەوەوە سەر هەڵدەدا کە پەیوەندی نێوان سروشت و مەعریفەمان دابڕاندووە لە جومگە سەرەکییەکەی کە جوانییە، چونکە هەر تەنها جوانی هاندەری بوون و مانەوەیە، سەرچاوەی لەززەتی مەعریفی و فەلسەفەش بووە- بۆ ئەم مەبەستە دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ فەلسەفەی ئەبیکۆریەکان کە هەرگیز مەعریفەیان لە چێوەی سروشت دانەدەبڕاندو هەرسێ چەمکی- سروشت- جوانی- لەززەت ببوو بەفاکتەری سەرەکی فەلسەفەی ئەوان، بەهەمان حاڵ ئەگەر پەیوەندی نێوان سروشت و مەعریفە هەر بەتەنها سەرهەڵدانی فەلسەفە بوایە ئەی چی لەو هەموو کەلتووره سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاشوبە بکەین؟ کە هەر بەتەنها جوانی- بەمانای داهێنان و مەعریفە- یان بەرهەم هێناوە، هەموو ڕابەرانی فەلسەفە بەر لە خزانە نێو دیالۆگەکانی ڕۆژانەی خۆیان دەچوونەوە ناو سروشت و ڕەنگە لەبۆن کردنی لکەپونگێ بەدەیان هەزار خانە لەمێشکیاندا گۆڕانی بەسەر داهاتبێ، ناپلیون بەر لەوەی بچێتە ناو شەڕەکان دەچووە ناو تەوژمێ لە سروشت و گەڕانەوە بۆ سروشتی وڵاتەکەی و لە سرووتێکی سۆفی ئامێزەوە یادی درەختەکانی دەرداری دەکردەوە و ئەوسا ناوی خوای لێ دەهێنا. هەرواش سەبارەت بە یولیوس قەیسەر و فتوحاتەکانی تەنانەت زەینەفۆن... لە هێرشەکانی بەدەیان کیسی بچووکی گەنمی وڵاتەکەی خۆی لەگەڵ خۆیا هەڵگرتبوو... بەکورتی پەیوەندی نێوان سروشت و مەعریفە جا هەر جۆر مەعریفەیەک بێت یەک چەمک بووە ئەویش بەرهەمهێنانی جوانی، لە سیاسەتدا بەرهەمهێنانی سەرکەوتن بووە کە ترۆپکی جوانییە، لە فەلسەفەدا حەقیقەت بووەو لە ئابووریشدا سوود و قازانج بووە، هەمان ئەو پەیوەندییە لە سیاسەتدا لەپێناوی وەبەرهێنانی جوانیدا شەڕو جەنگ و ئاشووبی وەبەر هێناوە و لە فەلسەفەدا ڕەشبینی و گەشبینی مرۆڤی لە بەرابەر کەوندا وەدی هێناوەو گەورەترین شەڕی

دەروونی بۆ مرۆڤ دروست کردووەو لە ئابووریشدا بەسەدان سیستەمی هێناوەتە ئاراوە... لە ئەدەب و ڕۆشنبیریشدا بەدەیان هەزار شیعر و ڕۆمانی دروست کردووە، کەواتە پەیوەندی نێوان سروشت و مەعریفە پەیوەندییێکی. بەتەنها فەلسەفی نەبووە، چونکە ئەگەر وابوایە هەموو پەیوەندییە ڕیازی و ماتماتیکییەکان دەچوونەوە ناو زەین و سروشتیان توورِ هەڵدەدا چونکە ناکرێ گوڵێک بەراورد بکەی بەتیۆری ڕێژەیی ئانشتاین، هەروەها سەرهەڵدانی زیندەوەر لەسەر مێزەکانی دوای نان خواردن، بەبێ بوونی هیچ هۆکارێک سروشتیان دەخستە ناو پرسیارەوە. بەم جۆرە پەیوەندی نێوان سروشت و مەعریفە لە شتە زۆر ئاڵۆز و لە هەمان کاتدا لە شتە زۆر زۆر سادەکان بەرجەستە دەبێ... تاوەکو ئێستاش هیچ بەڵگەیەکی ئەوتۆمان لەبەردەستدا نییە کە ئاخۆ هیچ مەعریفەیەک لە دونیادا هەبێ کەڵە گیاییێکی سروشتی داهێنابێ، بەڵام لە بەرابەر ئەوەدا بە هەزارەها بەڵگە هەن کە دەیسەلمێنن سروشت کۆمەڵێ مەعریفەی داهێناوە... بۆ نموونە هەموو هاوکێشە کیمیاییەکان لەسەر سروشت کاریان کردووەو ڕەنگدانەوەی سروشتن... ناکرێ هاوکێشەی لێکدانەوەی ئاو لە خودی سروشتی ئاو دابڕِ بکرێ... هەروەها سەرهەڵدانی مشەخۆرەکان. ئەو کاتەی کە سەرۆکی هیندییە سوورەکان نامەکەی خۆی بۆ سەرۆکی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا نارد سەبارەت بەو داوایەی کە سەرۆکی ئەمریکا کردبووی بۆ کڕینەوەی زەویوزاری سوورپێستەکان ئەو لە وەڵاما گوتبووی– ئێوە تا ئێستا سەرەڕای پێشکەوتنی تەکنەلۆژی خۆتان لە سروشت نەگەیشتوون چونکە ڕەنگە یەک ملیۆن هەناسەی ئێمە پەیوەست بێ بەدەنگی مێش و مەگەز و بۆقەکانەوە، ڕەنگە ئێوە نەزانن کە ئێمە لە سروشتی باوە فێری زمانپژان بووین– بۆیە داوای ئێوە بۆ کڕینی سروشتی ئێمە وەک ئەوە وایە داوای کڕینی ئاسمان بکەن– ئاخر ناکرێ زەوی و ئاسمان فرۆشتنیان لەسەر بێت. مارکس سەرەڕای غەرقبوونی لە نێو هاوکێشە ئابوورییەکان ناوە ناوە دەگەڕایەوە بۆ سروشت تا ئەو ڕۆژەی لەنێو پاوانێکیدا دیقەتی ئەفیونی کرد و لە ژێر پاکانی پلیشایەوە و بەم ئەفیونە لە سروشت سڕبوو و گەڕایەوە بۆ کلێسا و لەتەک پیاوانی کلێسا کەوتە خەوێکی قووڵەوە کە هەڵسا ئەوسا زانی کە ئاین وەکو ئەفیون مرۆڤ سڕ دەکات و ئەو کەتەگۆرییای نووسی کە دەڵێ



ئاین ئەفیونی گەلانە– بزانە سروشت چ فەرتەنەیێکی فەلسەفی دروست کرد، کەواتە سەرچاوەی هەموو مەعریفەکانی زانستی و مرۆڤایەتی سروشت بووە، سروشت جگە لەوەی کە بەرهەمهێنەری جوانییە، بەرهەمهێنەری تیۆرە زانستییەکانیش بووە، خۆ دۆزینەوەی تیۆری کێشکردن لە ئەنجامی بەربوونەوەی سێوێک بوو لە بەرزایی درەختەکانەوە، کە پرسی ئەوەی لای نیوتن دروست کرد ئاخۆ بۆچی ئەم سێوە سەر بەرەوخوار هەڵدەکشێ و بەرەو سەرەوە ڕەت نابات، بەم جۆرە سروشت بوو بە بەرهەمهێنەری پرسیارەکانیش لای ئادەمیزاد... بەداخەوە لای ئێمە بایەخێکی ئەوتۆ بە سروشت نادرێ، لە کاتێک ئێمە نەخاوەنی تەکنەلۆژیاییێکی بەهێزین و نەخاوەنی هۆکارەکانی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیشین، تاکە شتێ کە ئێمە خاوەنی بین، هەمان ئەو سروشتەیە کە لەبەردەستی خۆمان دایە، تەنانەت ڕۆژێ لەرۆژان هەوڵیشمان نەداوە سروشتی کوردستان ڕیزبەندو پۆلبەندیش بکەین لەکاتێک ئێمە شوێنی وامان هەیە تا ئێستا پێی ئادەمیزادی پێ نەکەوتووە و ڕۆژێ لەرۆژان هەرێمێکی سروشتیشمان دەستنیشان نەکردووە کە بیکەین بە هەرێمێکی پارێزراو وەک سروشتی خۆی پارێزگاری لێ بکەین، بەمەش نەک هەر زیانێکی زۆری سروشتەکەمان دەدەین، بەڵکو زیانێکی گەورەش لەو پەلەوەر و ئاژەڵە کێوییانە دەدەین کە ڕۆژ بە ڕۆژ لە کوردستان نامێنن و قڕدەبن، بۆیە من پێم باشە بەشێکی گرنگی هەوڵەکانی نووسین تەرخان بکەین بۆ لێکۆڵینەوە لەمەڕ سروشت کاریگەرییەکانی بەسەر بەرهەمهێنانی زەینیدا، ئەم کەم بایەخەمان دەبێتە هۆی ئەوەی بایەخ بە بەردەوامبوونی ژیانێکی خاوێنی و دوور لە پیسی ژینگە نەدەین و بەدەستێکی کەمی لە قەڵەم بدەین. هەرواش دەبێتە هۆی نەشارەزابوون لە کاریگەرییەکانی سروشت بە سەر مەعریفەوە، بەسەدان دەقی چیرۆک و شیعر و ڕۆمانمان هەیە هەموو هەڵقولاوی سروشت و هەڵقولاوی بەر کاریگەرییە سروشتییەکانن، بەڵام لێکۆڵینەوەیەکمان نییە باس لە سروشت و پەیوەندییەکانی بکات لە خەڵقکردنی داهێنان، بۆیە دەبێ ئێمە خوێندنەوەمان هەبێ بۆ سروشت و هەوڵی لێکوڵینەوەی دیاردەکانی بدەین.

## دەرکەوتنی خۆر

"مەبەست لە دەرکەوتنی (خۆر) دەرکەوتنی – شەمسی تەبریزییە بۆ مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی"(*)

خوێنەری ئازیز، هەر لە دوای خوێندنەوەی کتێبی پلە پلە تا ملاقات خدا – کە دکتۆر عبدالحسین زرین کوب نووسیویەتی، ویستم بەشی (٢٦)ی ئەم کتێبە بکەم بە کوردی، بەڵام زمانی نووسینی دکتۆر هێندە پڕ شیعر و شیعریەت بوو، نەمتوانی مافی خۆی بدەمێ، بۆیە هەر لەبەر ڕۆشنایی بۆچوونەکانی ئەودا کە هەندێ جار تێکەڵ بە وەرگێڕانیش دەبێ، ئەم نووسینەتان دەخەمە بەر چاو، هەر لەبەر خاتری ئەوەی بزانن کە عیشقی نێوان مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی و شەمسی تەبریزی چۆن بووە، کە بەڕاستی ئەوەی ئەو کتێبە بخوێنێتەوە، تەواو لە مانای ئەشق و خۆشەویستی دەگات.. پێی وا دەبێ کە عەشق هەموو دنیا دەهێنێ و دەتوانێ هەموو دنیا بکات بە موڵکی تۆ، هیوادارم کە بتوانم تۆزێکی زۆر کەمی ئەو عەشقەتان بۆ باس بکەم.

ژیان لە (کۆنیە)دا بریتییە لە بازاڕ و کارکردن و مزگەوت و خانەقا، بەڵام دوای هاتنی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی ـ بریتی بوو لە زەخرەفە و عەشق و فەنا و دەقی خودایی.. شاری کۆنیە ئارام ئارام گۆڕانی بۆ دەریا و ڕووبارو جۆگەلە دەچڕی، بەڵام پڕ بوو لە شۆر و وەلوەلە و زەنگ و زیوەزیوی دەف .. ئەوە ئەو کاتە بوو کە مەولانا گەیشتە سنووری (کۆنیە) ئەو کات موریدان و دەفژەنانی ئەو شارە، کەوتنە ناو خرۆش و گوڕو ڕەوشی ئاوازی شیعر و بازاڕی زەڕەنگران لەجیاتی ئەوەی چەکوشی خۆیان بۆ جوانترین شێوە داڕشتنی ملوانکە و ئەنگوستیلە بوەشێنن، هەموو بەیەکەوە کەوتنە سەر ئاوازی مەسنەوی مەولانا و هەموو بەیەکەوە چوونە ناو عەشقێکی ئەبەدی و شکایەت و حیکایەتی مەولانایان کردە سەرمەشقی خۆیان و

(*) "مەبەست لە دەرکەوتنی (خۆر) دەرکەوتنی – شەمسی تەبریزییە بۆ مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی"



دەردی فیراقی مەولانایان لە بیر مەولانا بردەوە و لانی کەم لە ڕوخساریان شاردەوە و بردیانە ناو دڵی گەورەی، ئەو دڵەی پڕ بووبوو لە برینی فیراق و هیجرەت.

ئیدی هەرکاتێ مەولانا بەناو بازاڕی زەڕەنگراندا ڕەت دەبوو، ئەوان ئاوازی چەکوشی خۆیان لە گەڵ ئاوازی شیعری مەولانادا جەمعبەند دەکردو تەواوی بازاڕ غەرقی ئەوای ئاوارەیەکی دوورە وڵات دەبوو، ئاوارەیەک کە توانیبووی لە ماوەی هاتنی بۆ ئەو شارە هەر هەموویان دیلی ئیقاعی شیعرو ڕەوتی داهێنانی خۆی و تەریقەتی بکات، بەڵام هێمنی ئەم شارە هێندەی پێ نەچوو، پڕبوو لە خەمی شیرین و پڕ بوو لە عەشقێکی گەورە تر کە مەولانا فێری عەوامی کردبوو.. سەرەنجام ڕۆژێ لە ڕۆژان.. مێژووی پۆڵابەندی سەلجووقییان شکا و مێژووی عیرفان و ئەدەب و شیعر جێگەی گرتەوە، ئەوە لەو کاتە دابوو کە پیاوێکی پیری تەمەن شەست و دوو ساڵە کە هەموو ژیانی خۆی لە سەفەر بەرەو نادیارەکان و یاخیبوون بەسەربردبوو، گەیشتە شاری ـ کۆنیەـ و سەودای سەری پڕ لە عیشق و عیرفانی ڕووەو لای مەولانا هەڵگرتبوو.. کە ئەو کاتە مەولانا سی و هەشت ساڵی عومر بوو، بەڵام کەشمە کەشمی دەروونی پڕ لە عەشق و شیعری هەموو دنیای داگرتبوو، سەداو ئاوازی شاعیرانە و عاریفانەی ئەو، هەموو ئاسۆکانی لە خوێنی شیعر ئاڵ کردبوو. مەولانا هەمیشە لە قووڵایی دەروونی خۆی ئەندێشەی ئەبەدییەتی دەکرد.. وەک چۆن دەگێڕنەوە لە مەدرەسەی بازاڕی پەمۆفرۆشاندا، زەخرەفەیەک دنیای خرۆشاند نەعرەتەیەک کەوتە ناو شاری – کۆنیە– و وەلوەلەیەک شاری تەنیەوە ئەویش ئەوەبوو کە (شەمس) گەیشتە مەجلیسی مەولانا و.. ئیدی هەمان ئەو ساتە بوو کە تەواوی ژیانی مەولانا گۆڕا و.. چرپە چرپی عاشقان بوو بە دەنگۆی ڕۆژانە و ساتەکانی نهێنی بوو بە ئاشکرای زەمانە.. دەروێش و مریدەکانیش لە ئاستی مەستیی مەولانادا پرسیاریان لە خۆ دەکرد، کە ئاخۆ ئەو گۆڕانە دەروونییە چییە سەراپای شاری داگرتووە و ڕووبارەکان هێمن هێمن .. درەختەکان هێمن هێمن هەتا شاخ و بەرد و گڵیش هێمن هێمن قسە لەگەڵ ئینسان دەکەن ..!

ئەمە گۆڕانێکی ڕەوحانی بوو .. گۆڕانێکی خودایی بوو، سەرجەم ڕۆحی شتەکان و مرۆڤی گرتبۆوە.. هەمان ئەو ساتە بوو کە (شەمس) بە دیداری مەولانا گەیشت و مەولانا بە دیداری ئارەزوو و عەشقی خۆی گەیشت، لە وێککەوتنی دوو ئەستێرە

دەچوو کە دوعای هەمووانی تێدا قەبووڵ بێ.. ئەوێ ڕۆژێ بوو ژیان و چەهچەهەی بولبولان تام و چێژێکی دیکەی دەبەخشی و کوورەی دڵی مەولانا مەشخەڵێکی دیکەی سەند، ئەو کاتە کە (شەمس) دەکەوتەوە ناو مەجلیسی مەولانا و هەموو غەرقی هەراو زەنای عاریفانەی خۆیان دەبوون..(شەمس) کە دەیبینی مورید و دەروێشانی مەولانا بە چ پابەندێکی ئەبەدی بە مەولاناوە نووساون، هێندەی دیکە گەرەکی بوو لە حاڵ و زیکری ڕابێنێ؟ دنیای مانای محەممەد (د.خ) بۆ تۆ بوو یا بۆ بایەزیدی بوستامی؟ ئەو بەرپرسیارە بوو کە تەواوی ژیانی مەولانای گۆڕی، مەولانا هێندەی دیکە لە عەشقی شەمسدا خوست مەست دەبوو و دەیگوت محەممەد (د.خ) سەری ئەڵقەی پێغەمبەران بوو، ناکرێ بە بایەزید بەراورد بکرێ..

ئەویش وەڵامی دەدایەوە : ئەی بۆچی ئەو دەڵێ: (سبحانک ما عرفناک) و بایەزید دەڵێ: – **سبحاني ما اعظم شاني** ـ ؟

پاشان مەولانا ڕادەما و وەڵامی دەداوە، بەڵام وەڵامی هێندەی دیکە ئاگری پرسیاری لە دەروونی شەمسدا خۆش دەکرد.

– ئاخر بایەزید تەنگ حەوسەڵە بوو، بە یەک فڕ دەکەوتە عەربەدەوە، بەڵام (محەممەد) دەریای دەنۆشی و بە جامێ ئەقڵ و سکوونی خۆی لە دەست نەدەدا..

مەبەستی (شەمس) ورووژاندنی مەولانا بوو.. بەڵام مەولانا ڕۆژ بە ڕۆژ غەرقی عەشقی ئەبەدی شەمس دەبوو.. عەشقی نهێنی و زانیارییەکانی ئەو، عەشقی دنیای زیکرو حاڵی ئەو، عەشقی سەرکێشی و سەفەرە نادیارەکانی ئەو:

هەندێ جار لەئاپۆرەی حەڵقەی زیکر و حەوشەی مەدرەسەدا نیگای (شەمس) بە مەولانای دەگوت:

– من لە دوور دوورەوە هاتووم و بەدوای تۆدا گەڕاوم، بەڵام تۆ بەو باری گرانی زانست و ئەندێشەت دەتوانی بگەیتە خوا؟ نیگای مەولاناش بەوی دەگوت:

"جێم مەهێڵە.. دەروێش لەگەڵمدا بمێنەوە تۆزێ ئەو بارە قورسەم لە سەر شان لادە!!..

مەولانا کە لەو پرسیارانەدا مەست بووبوو..هەرواش (شەمس):

دەڵێن ڕۆژێکیان (شەمس) دەچێتە مەجلیسی مەولانا و دەبینێ هەراو زەنایەکی زۆر لە ئارادایە و دەپرسێ ئەوە چییە؟



مەولانا دەڵێت: "ئەوە شتێکە تۆ نایزانی" بەڵام لەو کاتەدا کتێبەکان ئاگریان تێ بەر دەبێ..مەولانا دەڵێت "ئەوە چییە؟" شەمس دەڵێت" ئەوە شتێکە تۆ نایزانی!!"

هەروەها دەگێڕنەوە دەڵێن: مەولانا لە تەک حەوزی ئاوێ دادەنیشێ و شەمس دێتە میوانی ئەو دەپرسێ "ئەو کتێبانە چین" مەولانا دەڵێ :"ئەوە زانستی (قال)ە پەیوەندی بە تۆوە نییە..!"

شەمس یەک یەک کتێبەکان داوێتە ناو حەوزی ئاوەوە مەولانا تووڕە دەبێ و ئەویش بۆ خاتری دڵی مەولانا یەک یەک کتێبەکان ـ دەردەهێنێ، بەڵام مەولانا سەیر دەکاو دەبینێ کتێبەکان تەڕ نەبووینە و دەپرسێ:" ئەوە چییە؟"

(شەمس) دەڵێت : ئەوە "زەوق و حاڵە، تۆ چ خەبەرێکت لەوە هەیە؟"

ئیدی ڕۆژ بەڕۆژ مەولانا عاشقی (شەمس) و زانستی (شەمس) دەبێ و لەمیانی (قال) و (حاڵ)دا پەروەرشی خۆی دەکات، شەمس وردە وردە ئەوی دەکێشایە ناو دنیای خۆیەوە، کە دنیایەکی پڕ لە شوورو بێقەرار بوو، بەڕادەیەک تێکەڵی عەشقی شەمس بوو بوو کە هەرگیز یەک لەحزە بێ ئەو قەراری نەبوو، بەدرێژایی چەندین سەعات و سەعات گوێی لە سەدای شەمس دەگرت.. کە زمانی خامۆشی مۆسیقا و سەما بوو.. وەک سەدای وەحی وابوو زمانی گوتن بوو لە نەجوولانی زماندا .. زمانی هەڵاتن بوو لە ڕەوتی ئاوابووندا.. زمانی ئاسۆ بوو لە نیگەرانی بوولێڵدا. بۆ مەولانا کە ڕۆژ لە بانیژەوە هەڵدەهات (شەمس) بوو ئەو هەوایەی کە شادی و چالاکی لە سینەی ئەودا خەلق دەکرد (شەمس) بوو، دەرو دیوار – شەمس بوو.. کائینات و پشتی کائینات شەمس بوو.. ئەو عیشقەی کە خودا لە دەروونی ئەوی دەورووژاند شەمس بوو، ئەو شەمسی بە مەعشووقی خۆی دەزانی .. لە پاش دیتنی شەمس مەولانا خەڵکی بە جۆرێکی دیکە دەدیت.. دوای ئاشنا بوونی لەگەڵ ئەو عاریفە تەلەسم ئامێزە مەولانا ئاوازی شیعرەکانیشی گۆڕا و نیشتمان و دایک و حەبیبە و ئەستێرەی. لە (شەمس)دا دەبینی.

کاتێ کە مەولانا جەلالەدین لە خەڵوەتی ئەو عەشقەدا بەدەرکەوت، ئیدی خۆی بوو بوو بە (شەمسی تەبریزی) هەمان مەولانای جاران نەبوو.. ئەو کاتەش کە گەڕایەوە نێو خەڵوەت تا بە هەتوانی پرسیارەکانی (شەمس) تیماری ڕۆحی برینداری خۆی

بكات ـ شـەمس ـ شـاری كۆنیـەی جێهێشـتبـوو. وای خەبـەرێكی چەند دڵتـەزێن بوو، كـەوای كـرد مـەولانا تـەركی دنیـا بكات و لە تـای عـەشق داغ بـێ، لە (٦٤٢) تا(٦٤٣) مـەولانا لە نـاو عـەشـقی خـودایـی لە سـوورەتی (شـەمس)دا ژیـا.. بەڵام ئێـسـتـا تـەنـها خـەمبار، مـەلوول، كز وەك ئەوەی ڕوخساری خودا تەبەشی ئەوی جێهێشتبێ.. وایە.. لە دوور دوورەوە گـۆڕەكـەی دەزرنـگێـتـەوە. دەڵێن ئەو كـاتـەی كـە بـۆ دووەم جـار (شەمس)ی بینییەوە لە باوەشی گرت.. بۆ هەناسەیێكی درێژ.. درێژترە لە سەدەیەك، مـەولانا هـەسـتـی بەوە كـردبـوو كـە ـ گـیـانـی ئەو لـەگـەڵ گـیـانـی (شـەمس) هـیـچ جیاوازییەكی نییە–.

ئێـستـاش دوو گۆڕی جـیـان.. لە دوو مـەفـتـەنی جـیـا و دیوانەكـەشـی (مـەسنەوی مەعنەوی)دا بەناوی (شەمسی تەبریزی)یە.

**سەرنج**(*) هەمان ئەو شیعرەی كە دەڵێت:

بشنو أز نی چون حیكایت میكند
از جدائیها شكایت میكند .. هتد

باس لە دەردی فیراقی خۆی دەكات لە (شەمس) ئەگەرچی لێكدانەوەی تریش هەن.

دەڵێن دوای گەڕانەوەی (شەمس) بۆ كۆنیە هەر لە خەڵوەتخانەی مەولانا جەلالەدین مـایەوەو تووشی ئەڤینی كیمیا خاتوون بوو كە خەڵوەتخانەی هەمان ماڵی مەولانا بوو، ئیتر ئاگری ئەڤینی ژیانی (شەمس)ی گۆڕی .. بەڵام وەك بڵێی دڵی كوڕەكەی مەولانا بەم خاتوونەوە بوو.. بۆیە لە كێشەیەكی گرنگدا.. لە شەوێكی تاریك و تووندا (شـەمس) لای مـەولانا دادەنیشێ و كـەسێك دێتە ژوورەوە و (شـەمس) بانگ دەكەنە دەرەوە و (شـەمس) بە مـەولانا دەڵێت ئەوە بۆ كـوشـتـنم بانگ دەكـەن.. بەڵام مـەولانا ئەوی قەدەغە نەكرد لە چوونە دەرەوە، ئیدی كە دەچێتە دەرەوە دەكوژرێ..

دنیـا لـەبەر چاوی مـەولانا ڕەش دەبێ و تـا دوا سـاتەكـانی ژیانی لە شـیـعـردا (شەمس)ی زیندوو دەكردەوە، دەتوانین ئەوە بدركێنین كە مەولانا بە شاعیری فیراق

(*) مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی (جەلالەدینی كوڕی محەممەدی كوڕی بەهائەدین)، ئەم شاعیرە بە مەولەوی بەناوبانگە!



لە قەڵەمی بدەین .. فیراقی لە نیشتمان و فیراقی لە مەعشووق.. فیراقێ لە خوێن و فیراقێ لە سووتان. پاشان تێكەڵبوونی هەردوو فیراق و نەمانی سنوور لە نێوان نیشتمان و (شەمس)دا.

– كتێبی پلە پلە تا ملاقات خدا:

ئەم كتێبە كە بە ناوی ـ پلە پلە تا ملاقات خدا ـ یە دەربارەی ژیان و ئەندێشە و سلووكی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمییە و بە قەڵەمی دكتۆر (عبدالحسین زرین كوب) بریتییە لە (٣٩٤) لاپەڕەی قەوارە گەورە یەكێكە لەو كتێبە باشانەی كە زۆر بە وردی لە ژیان و بەرهەمی مەولانا و ئەزموونی نووسینی ئەم شاعیرە گەورەیە دەكۆڵێتەوە، نووسەری كتێب لە پێشەكیدا دەڵێت:

"(پەیژە پەیژە تا گەیشتن بە خودا) ئەم ناونیشانەم لەم ڕووەوە هەڵبژاردووە نووسیوە كە هێڵی ڕەوتەنی ژیانی مەولانا جەلالەدین محەمەدی ڕۆمی بەلخی و ناودار بە مەولەوی لە بارەی سلووكی ڕەوحانی و تەواوی ژیانی ئەو نیشاندەدا"

هەڵبەتە ناونیشانی ئەم كتێبە هەمان قسەی مەولانایە، بەڵام نەك هەمان قسە و تۆزێك گۆڕدراوە.

لە سەدەی حەوتەمی كۆچیدا ژیاوە، مەولانا ساڵی(٦٠٤)ی كۆچی لە (ربیع الاول) لە (بەڵخ) لەدایك بووە. بە یەكێ لە خواناسان و هۆنەرانی گەورەی ئێرانیش دێتە ئەژمار، جەلالەدین لە بەڵخدا لە دایك بووە. بەڵام لەبەرئەوەی زۆربەی ژیانی لە كۆنیەدا بردووەتە سەر بە ڕۆمی ناوبانگی دەركردووە، بەهائەدینی باوكی لەبەر ناكۆكییەك كە لەگەڵ خوارەزم شاییەكاندا هەیبوو لە ساڵی (٦١٠)ی كۆچیدا ڕێگەی بەغدای گرتەبەر و لەسەر ڕێگاكەیەوە كە بەسەر نیشاپووردا تێدەپەڕی، شێخ عەتاری چاو پێكەوت و عەتار پەڕاوی (اسرار نامە)ی پێشكەش كردە جەلالەدین كە لەو دەمەدا منداڵێكی گچكە بوو، بەهائەدین لەپاش حەجكردن و گەڕانێكی زۆر بەسەر وڵاتە ئیسلامییەكاندا ڕۆیشتە شام و ماوەیێك لەوێ مایەوە، پاشان چووە قوونیە و پاشماوەی ژیانی لەوێدا بردەسەر تا ساڵی (٦٢٨)ی كۆچی لە جیهان ماڵئاوایی خواست. جەلالەدین، كە لە كاتی مردنی باوكیدا تەمەنی (٢٤) ساڵ بوو، بە پێی ئەسپاردەی باوكی و تكای عەلائەدین لە جێی ئەو دانیشت و خەریكی ڕێنموونی

خەڵک و دەرس وتنەوە بوو، لە ساڵی (٦٤٢)ی کۆچی لەگەڵ خواناسی بەناوبانگ (شەمسەدین محەممەد)ی تەورێزیدا ئاشنا بوو. لەپاش ئەم ئاشنایەتییە، مەولەوی بەجۆرێ شەیدای شەمس بوو، کە لەبەر ئەو وازی لە هەموو شتێ هێنا و پەیوەندی خۆی لەگەڵ ڕابردوودا پچڕی و لە ڕیزی پەیڕەوانی ئەودا دەرهات.

شەمسی تەورێزی لە ساڵی (٦٤٥) لە کۆنیە دەرچوو ئیتر نەگەڕایەوە، مەولەویش لە ئەوینی ئەودا سووتا و خەریکی هۆنینەوەی هۆنراوە بوو، تا لە ساڵی (٦٧٢)ی کۆچی، کۆچی دوایی کرد. مەولەوی هۆنراوەی خواناسی گەیاندە پلە و پایەیەکی بەرز. گرنگترین پەڕاوی ئەو (مەسنەوی) و (دیوانی شەمسی تەورێزی)یە".



## لە مەڕ هونەری شێوەکارییەوە

١

هەر لە سەرەتاوە ئەوەی داهێنانی خەڵق کردبێ یاخود ئەوەی کە هەڵگری شوناسی داهێنان بووبێ، ئەوانە بووینە کە هەڵگری قەدەرێکی زۆر لە عیشق و ئەوین و هەڵگری ڕامانی بەهێز بووینە، هەموو ئەو چەمکە مانادارانەیان لە سینەیان پاراستووە و کردوویانەتە هێزی هزری خۆیان بۆ کارکردن لە ناو بوارەکانی داهێنان، کە شێوەکاریش بەشێکی گرینگی نێو ئەو پانتاییانەیە، هەر بۆیەش کە ئێستای هونەر بەراورد دەکەین بە سەرەتاکان، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە سەرەتاکان هێزی مانەوەیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرتووە و بەم هێزە جاویدانی هونەرییان بۆ خۆیان خوڵقاندووە، مەعریفەی سەرەتا لە هونەری شێوەکاری (مەبەستم پەنجاکانە) ئەبستیمی ڕۆژانەی بیرکردنەوەیان بوو، بەڵام ئێستاکێ هێزی زەیت بەهێزتر بووە لە هێزی مەعریفە و هزر، لە کاتێک هەموو زەیتێکی دونیا تابلۆیەکی زیندوو دروست ناکات بەڵام قەدەرێک لە مەعریفەی هونەری تابلۆی گەورە و جاویدان دروست دەکات، بەهەرحاڵ مەبەستمە بڵێم برادەرانی سەرەتا بە سێ ئەقنومی گرینگ کاریان دەکرد: عەشق، مەعریفە، شاکاردۆستی، بەڵام برادەرانی ئێستا بە سێ ئەقنومی نمایشی کار دەکەن کە بریتییە لە: زەیت دۆستی، نمایشگا، ژمارە، کە هی یەکەم بریتییە لە هونەری خەڵق دۆستی و هی دووەم بریتییە لە هونەری خەرج دۆستی.

هونەر پێویستی بە کوشتنی زات هەیە، پێویستی بە کوشتنی غەریزەکانی بەدیارخستن و خۆنمایشکردن هەیە، لە هەموویان زیاتر هونەری شێوەکارییە کە خوێنی هونەرمەندەکە دەخوازێ، بەو مانایەی کە لە دوای هەر تابلۆیێک تا ماوەیێکی زۆر سەرسامی و وەستان بەدیار تابلۆکانەوە ڕامی بکات و بەدوایاندا بچێت. واتە سەرسامکاری شوناسی هونەرە، پرۆسێسی بەرهەمهێنانی هونەری شێوەکاری پرۆسێسی کورتکردنەوەی زاتی هونەرمەندە و پرۆسێسی بەلەززەتکردنی ژیانی

ئەوانی دیکەیە، بۆیە هەمیشە هونەرمەندی شێوەکاری بە ئۆپۆزیتی ئەوانی دیکە دەوەستێ، بەوەی تا ئەو لە ناو داهێناندا خۆی کورت دەکاتەوە، هونەری بینین و ڕامان لە ناو ئەوانی دیکەدا درێژ دەکاتەوە، کە ئەمەش کارێکی هێجگار ئەستەم و دژوارە لە هونەری شێوەکاریدا. سەرەتاکان شانیان دایە بەر ئەم پرۆسێسە و بەڵام ئێستا ئەم پرۆسێسەیان دایە بەر شانیان، کە جیاوازییێکی زۆرە، هی یەکەم بۆ مانەوە و جاویدانییە هی دووەم بۆ بردنەوەییێکی کورت خایەنە، هی یەکەم پاراستنی دارستانەکانی ئێستێتیکای هونەرە، هی دووەم تەنها بۆ ژیانە لە ناو ئەم دارستانانە، هەر بۆیەش دەکرێ هی کۆمەڵەی یەکەمیان لە گەلگامێش کورت بکەینەوە و هی دووەمیش لە حیکایەتی چل تووتی خەست بکەینەوە. جیاوازی زۆرە لە میانی نەمردۆستی و ساتەوەخت دۆستی. هەر لە هەمان ئەم بەراوردکارییە مەسەلە تەکنیکییەکان دێتە کایەوە، ئاخۆ سەرەڕای نەبوونی ئەو دەسەڵاتە مەرجەعیەی کە ئێستا هەیە، بەڵام تابلۆکانیان بۆچی هەڵگری درەوشانەوەی باگراوندێکی مەعریفی زۆر بووینە؟

بەداخەوە دەسەڵاتی سەرچاوە لە ئێستا زۆر کەم لە هەندێ هونەرمەند بەدی دەکرێت، من هەندێ هونەرمەندی شێوەکار دەناسم کە لەگەڵیانا باس لە هونەر دەکەم، هەر دەڵێی چەند ساڵە لە ئەشکەوتن تازە هاتوونەتە دەرەوە، هەست بە هیچ گۆڕانێ لە مەودای هونەردا ناکەن، هونەری شێوەکاری بزاوتی فرشە دروستی ناکات بەڵکو هزر و ڕامانی فرشە وەشێن دروستی دەکات، ئەگەر هونەرەکانی دیکە هەموو شتێکی نەوێت بەڵام هونەری شێوەکاری پێویستی بە هەموو شتێک هەیە، هونەرمەندی شێوەکار لە کارکردندا لە دروود نزیک دەبێتەوە و مومارەسەی دەسەڵاتێکی خودایی دەکات لە خوڵقاندا. جیاوازییەکە لێرەوەیە کە هەندێ کەس پەی پێ نابەن. جا ئایا دەکرێ هەموو کەسێ ئەو دەسەڵاتە بەکار بهێنێت... بیری لێ بکەوە... وازدەهێنێ.



## ٢

هونەر بە هەموو بوارەکانییەوە بە تەنها بەسەر ئەوەوە ناگیرسێتەوە کە تەنها ئەنجامدانی پرۆسەی داهێنان بێ، دەخوازم بڵێم کاتێک هونەرمەندێکی شێوەکار بە تەنها خەریکی ڕەسمکردنی تابلۆ بێت و کار لەو تیمایانە نەکات کە خزمەت بە هونەرەکەی خۆی بکات و مشتومالّی هزر و بیری بکات و کولتوورێکی مەعریفیش بۆ نەوەکانی داهاتوو جێ بهێڵێ، ئەوە بەو مانایە دێت کە ئەو هونەرمەندە هیچ کاریگەرییێکی نابێ بۆ ئایندە، هەر بۆیەش ئەرکی هونەرمەندی شێوەکارە لە پاڵ کارکردن لە ناو تابلۆکانی هەندێ شتی تیۆریایی بخاتە بەر دیدی بینەرەکانی، واتە تیۆریزەکردنی ئەو پاشخانەی خۆی یا خستنە ڕووی جیهانبینی خۆی بۆ بینەرەکانی بۆ ئەوەی هەم لە هەڵوێستی فکری و مەعریفی ئەو بگەن و هەم ڕێنوێنی بێ بۆ نەوەی تازە. هەر لە ساڵانی شەستەکانەوە تاوەکو ئێستا کەم هونەرمەند هەبووە بەشداری لە پرۆژەی دامەزراندنی ڕۆشنبیری هونەری شێوەکاری بکات وەک تیۆربەندکردنی دونیابینی خۆی، بۆیە هەرچەند کارێکی هونەری زۆر و نمایشگاییێکی زۆریشیان کردبێ، ئەوە هێندە کاریگەر نەبووینە بەسەر نەوەکانی دوای خۆیانەوە، دەبێ دان بەو ڕاستییەدا بنێن کە زەمەنی ئەوە بەسەر چووە شێوەکار بە تەنها تابلۆ نەخش بکا و شاعیر بە تەنها شیعر بنووسێ و چیرۆکنووس بە تەنها چیرۆک، هەر بۆیە دەبێ ئەوانە بەشداری گرینگ بکەن لە هێنانەکایەوەی کولتوورێکی ڕەخنەیی پڕ لە مەعریفە واتە بەشداری بکەن لە دامەزراندنی پرۆژەییێکی ڕەخنەیی کە هێزی پەرەپێدانێکی بەگوڕی هەبێت لە مەودای هونەر و ئەدەبدا، بەگشتی تیۆریزەکردن و ڕەخنەبەندی لە ناو هونەرمەندانی کورد بە تایبەت شێوەکاران زۆر کەمە، من هەموو ئەو ڕەخنانەی خوێندوومەتەوە یا هەموو ئەو کارە تیۆریانەی خوێندوومەتەوە هی شاعیران یا چیرۆکنووسان بووە سەبارەت بە هونەری شێوەکاری، تا ئێستا نووسینێکی هونەرمەندی شێوەکاریم سەبارەت بە هونەر و کارەکان نەخوێندۆتەوە مەگەر بە دەگمەنێکی زۆر زۆر نەبێ، ئەمە جگە لەوەی کە کرمی بە حیزبکردنی هونەر و بە حیزبوونی هونەرمەند گیانی هونەری کوردی هەڵتەکاندووە و ڕۆحی داهێنانی لێ سەندوون، تاکە پاڵپشت بۆ هونەری شێوەکاری خودی ڕەخنە و تیۆربەندی هونەرییە کە بەداخەوە دەگمەنە.

## ٣

لە وەڵامی پرسیاری دووەمدا تۆزێ باسی ئەوەم کردووە، بەڵام دیارە ئەوە زیاتر هەڵدەگرێ، کلتووری قبوڵنەکردن و کلتووری جیاوازی نەخوازی لە نێو کوردا لە مێژە ڕەگی داکوتاوە، کە ڕەنگە هۆکاری سەرەکی دووربوون بووبێت لە ئاستەکانی مەعریفەی هاوچەرخ و کلتووری ڕەخنەیی نەتەوەکانی دیکە، بە پلەی یەکەم و ژیان لە ناو کەش و هەواییێکی خێڵ سیفەتی و دوورکەوتنەوە لە شارستانێتی، پاشان هەتا کلتووری سیاسیش کە خۆی هەڵگری شوناسی تاک ڕەهەندییە و ڕەخنە کاری لە ناو نەکردووە و هەمیشە هێزی بەرامبەری بە نزمتر لە خۆی زانیوە و ڕێگەی نەداوە ڕەخنەی لە بەرامبەردا قیت ببێتەوە، هەموو ئەوانە وای کردووە کە لە خودی هونەرمەند ڕەنگ بداتەوە و ئەویش هێزی قبوڵکردنی ڕەخنەی بەرامبەری نەبێت، ژیانی هونەری بەبێ بوونی ڕەخنەیێکی ئەکتیڤ و کاریگەر، پیر بوونە لە ناو نەهامەتی هونەری و وادەکات داهێنان لە ئاستێکدا بوەستێ و هێزی بینین و داهێنان و هەڵگرتنی مەعریفی نەبێت، ناکرێ سەرهەڵدانی ڕێنسانسێکی هونەری بەرپا بێ بەبێ ڕەخنەیێکی هاوچەرخ، دەبێ هونەرمەند هێزی ئەوەی هەبێ خۆی لە نەرگزییەت ڕزگار بکات، بۆ ئەوەی لەززەت لە هونەرەکەی وەرگرین قەدەرێ لە ماسۆشیەتی پۆزەتیڤ قبوڵ بکات.

من پێم وانییە هونەری ئەوروپی لە سەردەمانەکانی ڕۆشنگەری بەبێ ڕەخنە ئاوەها کاریگەر بوون، دڵنیام بزاوتێکی ڕەخنەیی گەورە هێزی داهێنانی داوەتەبەر هونەرمەندەکانی ئەوسا، بەتایبەت ئەوان بەر لەو سەردەمە ڕەنگە فشارێکی گەورەی کەنیسەییشیان لەسەر بووبێ، بەڵام چونکە جورئەتی ڕەخنەیی کاریگەر بووە، توانراوە کە بەهاییێکی ئێستێتیکی گەورەی هونەری بهێتە کایەوە، ڕەخنە لە ناوەندی هونەری شێوەکاری ئەڵقەیێکی ونی ئەم سەردەمەیە... چاوەڕوانی شاکار نیم لەو بێ ڕەخنەییەدا، ئەمە جۆرێک مردنی لەسەر خۆیە. مەبەستم لە شێوەکار هونەری جاویدانییە.



## ٤

بە پێی ئایدیاییێکی مارکسیزمی (مرۆڤ بریتییە لە شێوە). واتە دابڕینی ستایل لە هەر تەنێک یاخود لە هەر مژادێک، مرۆڤ بێ یا شتی تر، دابڕینی هێزی مانەوەیە لەو مژادە، چونکە شێوە هێزی ڕاکێشکردن و هێزی ئەفێکتیڤی هەیە و هۆیێکی گرینگە بۆ دروستکردنی بویەرێکی ماددی لە نێو چاوی بینەر و خوێنەردا، چونکە شێوە بە ئاسانی مشتومال نابێ و نایەتە بوون، بەڵکو هەموو ڕەگەزەکان دەگرێتەخۆ، جووڵە، بیرۆکە، داڕشتنی ڕەنگ، وەشانی فرشە، تێکەڵکردن، هەموو ئەوانەی کە شێوەیێک دەدەن بە کاری هونەری. هەڵبەت ستایل لە هونەرمەندێکەوە بۆ هونەرمەندێکی دیکە دەگۆڕێ، بەڵام هەموو هونەرمەندێ نابێتە خاوەن ستایلێکی تایبەتی خۆی چونکو ئەم جۆرە ستایلە تایبەتییە بریتییە لە پاشخانێکی مەعریفی گەورە + دیقەت و ڕامان و جیهانبینی+ وەستایی لە کارکردن و ڕاخستنی بەهرە، ئەوانەش کە پەنا دەبەن بۆ ئەفسانە و فۆلکلۆر، دەتوانن ئەم کارە بکەن و بایەخێکی گرینگیش لەم ئەفسانە و فۆلکلۆرەوە وەربگرن و ستایلێک بۆ خۆیان دروست بکەن لەم ڕووەوە، بەڵام چۆن؟

جیمس فریزە لە (الغصن الذهبي) بە قووڵی باس لەم بایەخە دەکات و توانیویەتی لە ڕێگەی کولتووری پێشینە و ئەفسانە و فۆلکلۆر، بابەتێکی مەعریفی هاوچەرخ دروست بکات، هەروەهاش شتراوس لە (فیکری دەشتاییی)دا، بەڵام ئایا ئەو هونەرمەندە شێوەکارانەی ئەمڕۆ کار لە ناو ئەفسانە و فۆلکلۆر دەکەن، ئاستی شیکردنەوەیێکی مەعریفی جوانیان هەیە لەم ڕووەوە یا هەر بە تەنها کۆپیکارێکی پیشەیین؟ لە هی یەکەمدا ئەوانەن کە قووڵ دەبنەوە و خەڵقی داهێنانێکی دیکە دەکەن لە ناو ئەم کولتوورە، لە هی دووەمدا، بێ توانا و هێزی بەرهەمهێنانی مەعریفییان نییە و بە تەنها لاسایی سروشتی شتەکان دەکەنەوە، وەڵامدانەوەی چێژی خەڵک بە کاری لاواز ناکرێ، چێژ لە سروشتدا یاخود لە ئەسڵی مرۆڤدا قبوڵی شتی بێ ناوەڕۆک ناکات، قبوڵی ستایلی تەپیو ناکات، چونکو ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە ڕژێنی سنەوبەری زەینەوە.

### ٥

بەڵێ ئیمڕۆ لە کوردستان کۆمەڵە گەنجێکی زۆر کاردەکەن لە بواری هونەری شێوەکاریدا، هەڵبەت زەمەن کەفیلە بە تەتەڵەکردنی ئەم کۆمەڵە، چونکو هەندێ جار کە عەشقی بوارێک هات ئیدی کۆمەڵێک خەریک دەکات، بەڵام گرینگ ئەوەیە کە ئەم عەشقە تا چەند بەردەوام دەبێ، هەندێ جار لە سەرەتاوە دەپووکێنەوە، هەندێ جاریش لە نیوەی ڕێ و، هەشە تا دواساتەکانی ژیانی ئەم عەشقە پەروەرش دەکا و دەیکات بە ستوونی داهێنانەکانی خۆی، من کەمتر ئەوە دەبینم کە ئەوانە ببن بە خاوەنی ستایل و ئەزموونی تایبەت بە خۆیان بە بێ زامنکردنی پاشخانێکی مەعریفی بە هێز، ئەگەر هەشبن ئەوە دەبێ دەگمەن بێ، من لە یەک لە پرسیارەکان وەڵامی ئەوەم داوەتەوە کە بۆچی نەوەکانی پێشوو کاریگەرییان کەمتر هەبووە بەسەر نەوەی تازە، چونکە ئەوان بەتەنها تابلۆیان دروست کردووە و هیچ کارێکی ڕەخنەیی و تیۆرییان لە دوای خۆیان جێ نەهێشتووە تا نەوەی تازە سوودی لێ وەرگرن و تەئەمولی تێدا بکەن، ئەوەش وای کردووە کە نەوەی تازەش هەر لەسەر تەگبیری ئەوان بڕۆن، ئەوانیش کەمتر بایەخ بەم بوارە بدەن، باشترین تاقە ڕێگا بۆ نەوەی تازە ئەوەیە کە خۆیان خەڵقی زهنیەتی خۆیان بکەن و بپرژێنە سەر لایەنی مەعریفی هونەر.



## بابەتی هەمە جۆر

* هیچ ئاماژەیەک نییە ئەوە ڕەت بکاتەوە کە ڕەخنە دروستکردنی دەقێکی دیکەیە، ئێمە بە هەڵە لە ڕەخنە گەیشتووین، کە پێمان وایە ڕەخنە ڕەقیبی سەر دەق و نووسینەکانە، یاخود هەوڵێکە بۆ هاوێرکردنی ڕەهەندەکانی دەق، هەموو ئەم جۆرە بۆچوونانە، ئەدەبێکی بێ ئەزموون و بێ شاکار دروستی کردوون و هەڵیرشتوونەتە ناو پانتایی کولتوورەکەمان، زۆر جار بێ سەلیقەیی حوکمی کردووە، زۆر جارانیش بێ ئەزموونی لەکەداری کردووە. پێویستە ئێمە بتی ئەم جۆرە بۆچوونانە لەناو پەرستگای ئەم کەلتوورە وردوخاش بکەین، چونکە هۆیەکە بۆ دروستبوونی حاڵەتی سکون لە داهێنان، ئەمڕۆ و دوێنێی ڕەخنە لە جیهاندا وانەبووە، لای ئێمە بە ئینتەرێکی وەسفی دوور لە جاویدانی ڕەخنە بەڕێوە چووە، ڕەخنەگرەکان تەنیا ڕوخساری دەقەکان دەبینن و بێ ئاگان لەو خوێنەی لەژێر پێستی ئەو ڕوخسارە بازرقەدا، ئەمە لەلایەک لەلایەکی دیکەوە ڕەخنەگرەکانمان هەمیشە بەدوای مۆد دەکەون و وەک تووتی لاسایی دەکەنەوە، زۆر جارانیش لەبەر هەزم نەکردنی ئەو مۆدە تێدەکەون و سەر لە خۆشیان دەشێوێنن، هیچ ڕایەکی خۆیان نییەو لە سێبەری ئەواندا دەجوولێنەوە، بۆیە نەدەتوانن شارەزای زمانی ڕەخنە بن و نەدەتوانن بە ئەندازەیەکی ڕەخنەیی ڕەسدی بزاڤە ڕۆشنبیریی و دەقەکان بکەن. هەر بە پێی ئەو بۆچوونەی خۆم سەبارەت بە ئێستای ڕەخنەی کوردی کە ئاخۆ لە بڕستیدا هەیە کاری دەستنیشانکردن بگرێتە ئەستۆ... دەڵێم: ڕەخنە کە لە بنەڕەتدا بە بەرەواژی وەرگیرابێ چۆن دەتوانێ کرێکی ئاوا بکات.. بەڵام ئەو کاتەی ڕەخنە لە ڕەحمی ڕەگاژۆیی ئەزموونەوە لە ڕەحمی شاکاری دیارەوە، لە ڕەحمی لێکدانەوەی قووڵ و پشتی دەقەکانەوە داڕێژرا، نەک هەر دەتوانێ دەنگێک یا وەچەیەک دەستنیشان بکات، بەڵکو لە توانایدا هەیە ڕەوت و ڕەهەندی کولتوورێک بەتەواوی بگۆڕێت و هەتا کاریگەریش بێت بەسەر چەندین بڕیاری گرنگی ڕۆشنبیری و سیاسیشەوە..

ڕەخنەی ئەدەبی کوردیش هەر بە دەردی ئەم سەلەفییەتەوە تووشی ڕیزکردنی ناو بووە...

* ناکرێ بە داهێنانی شیعری فلان بڵێین سەر بە قوتابخانەی فلانەو ئەویتر سەر بە قوتابخانەی فیسارە... چونکە داهێنان یەک داهێنانە، لە دیدو بۆچوون جیان و سەر بە ئەلف و بێی هیچ قوتابخانەیەک نییە، چونکە هەر کات و دەرگاو پەنجەرەی قوتابخانەکەمان بۆ کردنەوە، ئەوا خاسیەتی داهێنان لە بەین دەچێ و قوتابی و مامۆستای بۆ دروست دەبێ، دەبێتە پیشەیەک وەک هەموو پیشەکان کە من بۆ خۆم باوەڕم بە مەکتەبدار کردنی داهێنان نییە، لە ڕاستیدا ئەمڕۆکە ئاستی داهێنان هێجگار کەم بووە، من زۆر بە وردی دەیانخوێنمەوە، هەوڵ دەدەم بچمە بنج و بناوانیانەوە، بەڵام بەداخەوە نە لە شیعر گەیشتووەو نەدەزانێ پرۆسەی نووسینی شیعر چییە، زۆربەی شاعیرانی ئێستا لە پڕێکا هاتوونەتە سەر شیعر، بێ ئەوەی لە چەمکی زمان گەیشتبن. یاخود بێ ئەوەی شارەزای شیعر بن، پەیامی ڕیالیزمی سۆسیالیستیش پەیامێکی دروست کراوە، بە بڕیاری سیاسی هاتە سەرپێ و کۆمەڵێ لە نووسەرانی هەڵخەڵەتاند و کۆمەڵێکیشی وردوخاش کردن و تووشی نەهامەتی کردن.

* ڕیالیزمی سۆسیالیستی پێستێکی فینۆمۆلۆژی نییە بچیتە ناویەوە، هەوڵی داوە شاعیر لە شیعردا، چیرۆکنووس لە چیرۆکدا و ئەکتەر لە بەرهەمی هونەریدا وەک جەستە لە پرۆسەی داهێنان بێ و وەک ڕۆح و بزاوتیش لەنێو کارگە و شانە حیزبییەکاندا بن، ڕیالیزمی سۆسیالیستی بەرهەمی چینایەتییە، یاخود دەرهاویشتەی فەلسەفەی کرێکارییە... هەر لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ەوە بڕیاری سۆڤیتاتی بۆ دەرچووە، واتە ڕێبازێکی بڕیارلێدراوە... نەک خوڵقاو.

واتە ویژدانی داهێنەر دروستی نەکردووە، بەڵکو چەکمەی حزبی دروستی کردووە، ئەو نەتەوانەش کە لە سەردەمی بزاڤی ڕزگاریخوازیدا بوون لە سەرەتاوە باوەڕێکی بەتینیان هەبوو بەوەی کە ئەم ڕێبازە دەتوانێ خزمەتی ئەم بزاڤە بکات، بەڵام بەداخەوە بۆ ئێمەی کورد لەم سەردەمەی ڕزگاریخوازیدا کۆمەڵێک بتی دروست کرد و کەڵەکەیەک نووسینی مردووی خستە سەر دەقەکانەوە. لە بنەڕەتدا ڕێبازی سۆسیالستی دژ بە جیهانبینی نووسەرە، دژ بە ئازادی نووسینە، هۆیەکیشە بۆ



قۆچانێ کردن لەگەڵ ڕەوتی نەتەوەگەرایی، بە دەیانی وەک مایکۆفسکی کە خۆیان بەو ڕێبازە هەڵواسی و ڕایانگەیاند کە تاکە ڕێبازێکە بۆ ڕزگارکردنی داهێنانی ئەدەبی، کەچی هەر خۆشیان وەکو نووسین و وەک جەستە بوونە قۆچی قوربانی ئەم ڕێبازە... هەندێکیش لەبەرئەوەی بە شەویلاکی حزبایەتییان زانی دژایەتیکران، لە زێدی خۆیان دوورخرانەوە، دکتۆر ژیڤاکۆ کە خودی باسترناکە نموونەیەکی گەشی ئەم دژایەتی کردنە بوو... دەمەوێ ببم بە خۆم چونکە ناتوانم ببم بە کەس . چیرۆکنووسین کارێکی هاسان نییە، دیاردەیەکی هەڵقوڵاوی ئەزموونی مەدەنیەتە، بۆیە هزر و خەباتێکی ڕۆشنبیری هاوچەرخی پێدەوێ، شەونخوونی ناو کتێبانی دەوێ، هەر لەم ڕوانگەشەوە دەتوانم بڵێم چیرۆکنووسانی لاو ئەوەیان نیشان نەداوە .. هەرچەندە من خۆم باوەڕم بە چیرۆکنووسی لاو و بە تەمەن و لەم جۆرە شتانە نییە، باوەڕم بە داهێنانە جا هەر کەسێ بیکات، ئەوەی زۆر سەرنج ڕادەکێشێ لە خوێندنەوەی چیرۆکەکان ئەوەیە هەست بە بێ بنەمایی دەکرێت، هیچ حیکمەتێک لە نووسینیان نابینم، زمان و شەل و دیدکزە، هەوڵیان نەداوە جیهانبینی خۆیان پەرە پێ بدەن، چیرۆک و ڕۆمانیش بێ دروستبوونی ئەو دیدگایە نانووسرێ، زۆربەی گەنجەکانیش جگە لە زمانی کوردی هیچی دیکە نازانن، بەتایبەت بەم دواییە، گەنجی وا چیرۆک دەنووسێکە لە زمانی عەرەبیش هیچ نازانێ، بۆیە خوێندنەوەی ئەوانە تەنیا ئەدەبی کوردییە، لەم ڕووەدا دەبێ هەوڵێکی باش بدەن بۆ ئەوەی پەرە بە ئەزموونی خۆیان بدەن، پێموایە عەتا محەمەد چیرۆکنووسێکی باشە، ئەسکەندەر جەلال خەیاڵی پێیە، بەڵام زمانی خراپە ئارام کاکەی فەللاح چیرۆکنووسێکی باشە، بەڵام ئەوەی کە بەلامەوە زۆری لایە و دەستی بەسەر قووڵایی چیرۆک دادەشکێ (جەبار جەمال غەریب)ە کە زۆر سەرنجی ڕاکێشاوم. دیکارت بەر لە چەندین ساڵ وتی: (لە دنیادا هیچ ئەمرێکی یەقین نییە) گومان بۆ کاری بەرهەمهێنانی دەق لە ڕەوتی فەلسەفی خۆیدا وەک چەمک دەچێتە دەرەوە و ڕۆڵی ئێستەتیکا دەگێڕێ لە ڕەنگڕێژکردنی دەق، زۆر جار گومانێک دەقێکی گەورەی پێ دەنووسرێ، بەڵام (گومان) پێویستی بە زمانێکی بەهێزو پڕ حیکمەت هەیە، زۆر کەم هەن بە (گومان)ی دەق وترابن، شاکارترین دەق شانۆنامەی (هاملێت)ی شەکسپیرە کە لە کاتی خوێندنەوەیدا ئەمیری دانمارک داتدەگرێ، لەمیانی تۆڵە و گوماندا سەما بە خوێنەر

دەکات، تەنانەت هێندە بەهێزە تا ڕادەی ئەوەی شەکسپیر دەڵێ: (یا لیت الازلي لم یضع شریعتة).

پێم وایە سەرتاسەری مرۆڤایەتی لەنێو گومانێکی ئەفسووناوی دەژیت و هەمیشە لە پرسیاردان، خوڵقاندنی فەلسەفە جۆرێک لە گومانە بەرانبەر بەم کەونە پانوپۆڕە، یەقین لەبەرامبەر گوماندا زۆر جاران بێ ئومێدی دروست دەکات و وا لە مرۆڤ دەکات ڕۆحی تۆڵەسەندنەوە سەنەگەی لەسەر هەڵنەگرێ. گومانی دیکارتی دوو جۆر بوو، گومانی گومانکاران کە گومانێکی داخراوە، گومانی مەنهەجی کە هەمیشە بەرەو یەقین دەڕوا... داهێنەرانی ئەم دنیایە هێجگار زۆرن، تەنانەت هەندێ جار کە بەناو کتێبخانە گەورەکاندا دەگەڕێم و دەسووڕێم، زۆر جار ئەو پرسیارە لە خۆم دەکەم کە ئاخۆ ئێمەی کورد لە کوێی ئەم هەموو داهێنانە مرۆڤایەتییەداین، داهێنان هەموو بوارەکانی گرتۆتەوە لەوێ لە ئەلیژیریای ئیتاڵیدا دانتی بە هەر سێ بەشی کتێبەکەی کۆمیدیای خوداوەندی ـ دۆزەخ و پاکستان و فیردەوس بەشێک لە سروشتی مرۆڤایەتیمان پیشان دەدات. لە نیشتمانی بەفرو چیای بەرزی ڕوسیادا دیستۆفسکی لە برایانی کرامازۆف و هەرماسدا گەورەترین درامای بەشەری خوڵقاندەوە. لەسەر شانۆکانی بەریتانیاش شەکسپیر لە هاملێت و شالێردا مەینەتییەکانی مرۆڤی نووسیوەتەوە، لە میانی تەمومژی شاخە بەرزەکانی هەورامانیشدا (نالی) غوربەتی مرۆڤی نووسیوەتەوە. زۆرن ئەو داهێنەرە گەورانەی کە لە سەرتاسەری زەمیندا هەن، هەر لە ستۆریاس و گابریێل و فلۆپێرو ئیتماتۆف و ئەلیوت و سیلونە و دەیان کەڵە نووسەری داهێنەری دیکە کە هزری مرۆڤیان ئاوەدان کردۆتەوە. پێموایە ئەو سێ بەرهەمەی ئینیاتسیو سیلۆنە کە بریتییە لە (فۆنتامارا) نان و شەراب، تۆوی ژێر بەفر، کە سێ ڕۆمانی تەواوکەری یەکترین بکرێ بە کوردی زۆر باشە. هەروا کتێبی (دوا وەسوەسەی مەسیح)ی کازانتزاکی و (ئەفسانە لە میان باوەڕی دێرین و تەورات)ی عەلی ئەلشەوک و هەردوو بەشی (ژنانی عاشق)ی د. هـ. لۆرانس و (مۆبی دیک)ی هرمان ملفل و (جوانییەکانی شوێن)ی باشلارو سوور و ڕەشی ستاندال. ئەمانە هەمووی بەرهەمی گرنگی مرۆڤایەتین وەرگێڕانیان بۆ کوردی زۆر بە نرخ دەبێ.

×××



# مۆدێرنزم

دەرهاویشتەی پەرەسەندنی زانست و تەکنۆلۆژیایە، لەدایکبووی شارستانی و مەدەنیەتە . دەشکرێ لەو وڵاتانەی کە خودانی ئەم پرۆسێسەن چەمکی مۆدێرنزمیەت ئاشکرابێ و وڵاتە بچووک و نەتەوە ژێردەستەکانیش سوودیان لێ وەردەگرن و هەندێ لە چەمکی مۆدێرنزمیەت بگوازنەوە نێو کولتووری خۆیان بە مەرجێ دەبێ زۆر بە ئاگا لەخۆبوونەوە بێت... هەروەها دەبێ زۆر بە وریایی و چاوساغییەوە بێت، ئەگینا دەکەونە نێو داوی تەقلیدییەت و گواستنەوەی میکانیکی و ڕەنگە لە ئاکامدا وردوخاش بن، ... ئێستێکە لەلای ئێمە مۆدێرنزمیەت هێندە باسی لێ دەکرێ کە ئەوەندە لە وڵاتە پێشکەوتووەکانیش باس ناکرێ، کە سەیری بەرهەمە ئەدەبییەکانیش دەکەین، جگە لە شیعر و چیرۆک هیچ شتێکی دیکە نابینین، ئەوانەشیان بە لنگەوقووچی.. کەچی مۆدێرنزمیەت پرۆسەیەکی شمولی فراوانە دەبێ هەموو لایەنەکان بگرێتەوە. مۆدێرنزمیەت بریتیی نییە لە عەجایب نووسین و غەریبکردنی ڕستە و دێڕ وەک چۆن لە زۆر شیعری ئێستادا دیارن، بەڵکو مۆدێرنزمیەتی نووسین لەوەدایە کە چۆن چەمکەکانی جوانی و سیمبولە نادیارەکان و ئەو شتانەی کە ناکەونە دەست کەشف بکەین و دنیایێکی تازەی پڕ لە ڕەهەندیان لێ دروست بکەین غەرقی واتا و ئاماژە بن، من بۆ خۆم پێموایە پلەی گەرمی ئەم مۆدێرنزمیەتە هەر بە خۆڵەمێشی لەدایک بووە، ژێرو ژووری پێوە دیارە. ئێستێکە سیمای شیعری کوردی سیمایەکی تەڵخی هەیە، پێویستە بە (حسی) جوان و دیدگای قووڵ جوان بکرێتەوە، کار وا بڕوا ئێمە دەبینە خودانی شتە ناشیرینەکانی بەناو شیعر.، شێوازی مۆدێرنزمیەت بەوە تەواو دەبێت کە شتێک بنووسین، سیمای شارستانیەتی هەڵگرتبێ بە هەموو کەف و کوڵێکەوەو تا چ ڕادەیەک توانای ئەوەی هەیە خوێنەر لەگەڵ خۆیدا بگۆڕی و تووشی سەرسامیی بکات. جەنگێکی ئەزەلی لەنێوان کۆن و نوێدا هەیە، کە مەحاڵە کۆتایی پێ بێت چونکە کۆن هەمیشە جۆرێک

لە سەلەفیەتی بیرکردنەوە لە ڕەحمی خۆیدا هەڵدەگرێ، نوێش هەمیشە جۆرێک لە دژایەتیکردنی ئەم جۆرە بیرکردنەوانەدا دەخاتە ئاراوە، ئەمانەش دوو قوتبی دژ بە یەکن، بۆیە ئەم جەنگە دینامیکییەتی خۆی دەپارێزێ و لە وەستان ناکەوێ، حەقیقەتی (فۆرم و ناوەرۆک) وەک دوو بەشی گرنگی جەستەی دوو دەقە ئەدەبییەکان مشتومڕی زۆری لەسەر کراوە، کە ئاخۆ کامیان جەوهەری دەق دەستنیشان دەکەن.

زۆر جاران (فۆرم) خۆی ناوەرۆکە یا ڕوونتر بڵێم زۆر جاران لە دەقێکی ئەدەبیدا فۆرم واتای دەق دەخاتە ڕوو بێ ئەوەی بەدوای ناوەرۆکدا بگەڕێین، هیچ کاتێ: کێشە نایەتە ئاراوە، لە پێشخستن و پاشخستنی ئەم دوو چەمکە، هیچ دەقێکی ئەدەبیش نابێتە خودانی فۆرمێکی بەهێز بێ بوونی ناوەرۆکێکی بەهێز.... ئەمڕۆ داهێنەران بەرەو دەقی بەرز دەگەڕێن، کە تەجاوەزی ئەم جۆرە مشتومڕانەی کردووە.

هەر کاتێ لە دەقێکی ئەدەبیدا فیکرو زەین و هزر بەرەو ترۆپک چوون و لە ترۆپکی مەلەوانگەی واتا دابوون، فۆرم بەناچاری دەبێ تەکانێ بدا و خۆی بەهێز بکات، ئەگینا دەتەقێ و هەرچی هزر و زەینە هەڵدەڕژێ.

×××





## شیعر و سۆفیگەرێتی و زمان و دەسەڵات

سۆفیگەریەێتی ڕێبازێکی ئاینی ناو بزاوتی باوەڕە هەمیشە لە گێرمەو کێشەدا بووە، لەگەڵ باقی تەوژمەکانی دیکەی ئاین، هەوڵێکە بۆ گەیشتن بە ڕۆحی باڵا، بەبێ هیچ وەسیلەیەک کە لە نێوان خۆیان و ئەم ڕۆحە باڵایە دایە و، زێتر لە تەقسی سووتان و بە خۆڵەمێش بوون دەچێ و سیمای ئەفسانە لە خۆدەگرێ، بۆیەش زیاتر لە هەموو ڕێبازەکانی دیکە پەلوپۆ بۆ ناو بەشەکانی دیکە دەبات، لەوانەش بۆ ناو ئاینی شیعر. کە دەخرێتە ناو ئاینی شیعر جۆرێک لە بخور دروست دەبێ و شیعر بەهۆی سیمبولەکانی ئەم سۆفیگەرێتییە بەرەو ڕەهایی دەچێ، ...ئارەزووەکان لەنێو ڕستەو وشەدا لەگەڵ ئارەزووی خودی نووسەر تێکەڵاو دەبێ و بەرەو ڕۆحی باڵا هەنگاو دەنێن، مەرج نییە شیعری سۆفیگەرێتی شیعری ڕاستەقینەو بێگەرد بێ، زۆرجاران شیعری سۆفیگەرێتی غەرقی گومان و گێرمەو کێشە و وەسوەسە و سیحرو ئەفسوون دەبێ، هەندێ جاریش جۆرێک لە شێتایەتی منداڵی دروست دەکات و کەف و کوڵی عەشق دەخولقێنێ... ڕەنگە زۆر لەم بابەتانە پڕ لە گرێ و گۆڵ بێ و زۆر زبرو دڕبن، لەلای ئێمە واباوە کە ئەگەر شیعرێک باس لە خوا و فریشتە و شتە باڵاکان بکات، ئیدی دەبێت بە شیعری سۆفیگەرێتی کە وانییە و هەرگیز تصوف لە شیعر بەم شتانەوە دروست نابێت... بەڵکو بەو جیهانبینییەوە دروست دەبێت کە هەوڵێک بۆ گۆڕانی خودو جووڵاندنی ئەم خودە بەرەو تێکەڵبوون لەگەڵ ڕۆحی باڵادا و هەوڵێکە بۆ ڕزگاربوون لە کۆت و فڕین لەناو ڕەهاییدا..

هەر لە چاپکردنی دیوانی یەکەمم بەناوی (خاک و هەڵۆ)وە تا دوا دیوانە شیعری درامیم کە بەناوی (وردی گەڵا) بوو زۆر کەس شتیان لەبارەوە نووسیوەو ئاوڕیان لێ داوەتەوە لە شاعیرو نووسەرو ڕەخنەگرەکان، بەڵام ئەوەی کە من بە کاری ڕەخنەییم زانیون هەندێک لە نووسینەکانی عەتا قەرەداغییە کە بە ڕوئیای خۆی دەنووسێ، هەروەک ئەم نووسینە چوار ئەڵقەییەی نووسەرێکی گەنج بەناوی (ڕەفیق غەفوور)

بوو کە ئێستا لە دەرەوەی وڵاتە کە زۆر بە وردی دیوانی (تەمە سپییەکانی ڕۆح)ی شی کردبوەوە و کەناڵەکانی تێدا کەشف کردبوو.

من شیعرم نووسیوە و زیاتر لە ٢٠ ساڵ ئەزموونی شیعرم هەڵگرتووە، ئەزموونێکی ٢٠ ساڵ کتێب و خوێندنەوەو موناقەشە... بەتایبەت خوێندنەوەی ڕۆمان، زۆر جاران ئاگری چیرۆک و ڕۆمان هەڵچوونەکانم دادەگیرسێنێ... بۆیە من چیرۆکم نووسیوە، لە ڕاستیدا من باوەڕم بە تاک لایەنی نووسین نییە، باوەڕم بە سنووری نێوان ژانرەکانی ئەدەب نییە، بۆیە کە مومارەسەی نووسینی چیرۆک دەکەم هیچ جیاوازییەک نابینم لەوەی کە مومارەسەی نووسینی شیعر دەکەم.. من لە (١٧) ساڵی ڕۆمانم نووسیوە و زۆر لە برادەران خوێندوویانەتەوە و هەوڵی زۆرم داوە ڕۆمان بنووسم، بەڵام هەرگیز نەگەیشتوومەتە ئەو قەناعەتەی بڵاویان بکەمەوە، چونکە ڕەنگە لە ئاستێکی باشتری هەندێ ڕۆمانی بڵاوکراوەی ئێستا بن، دوا چیرۆک کە بڵاوم کردۆتەوە دوای نۆڤلێتی (کەمتیار) چیرۆکی (ماینی گۆڕستان) بوو کە لە ناوەرۆک و فۆرمدا گۆڕان هەیە، هەموو ڕاز و نهێنیی هونەرمەند و ئەدیب و نووسەرانی دنیا لەوەدا بووە کە توانیوویانە خۆیان بدۆزنەوە و ڕەهایی ناوەوەی خۆیان بەدەست بهێنن، هەرگیز نووسەری گەورەو مەزن دروست نابێ بێ بوونی ئەم ڕەهاییە- بیرۆکەی قووڵ و هزری بەهێز لەناو سەرێکی یەخسیر و دیلدا دروست نابێ، ئەمە لە لایەک، لەلایەکی دیکەوە نووسەر بێ ئیستیعابکردنی ڕەوتی شارستانی و موفرەداتی ڕۆشنبیری ناتوانێ بێتە ئاستی داهێنەرانی جیهانی، نموونەشمان لەم ڕووەوە هێجگار زۆرە، بەتایبەت داهێنراوەکانی سەدەی نۆزدەهەم لە ڕۆمان و شیعرو چیرۆک و مۆسیقادا... دەسەڵاتی دەق دەستەواژەیەکە لەسەر جەستەی ترس، زێتر پرسیار بەرهەم دێنێ، یاخود پرسیارێکە بۆ ئەفراندنی دەیان پرسیاری دیکە، دەچێتە کایەی لەناو بردنی وەڵامی هەمیشە لەسەر زار و وەڵامە ئامادەکان، ئەو وەڵامانەی کە لەڕاستیدا وەڵام نین بەقەد ئەوەی پەردەکێشانە بەسەر حەقیقەتەکان، هەر کاتێکیش پرسیار وەڵامی ئاوەهای وردوخاش کرد ئەو کاتە سەرەتایی سەرهەڵدانی و داهێنانی ڕاستەقینە دێتە کایەوە، دەسەڵاتی دەق بریتی نییە لە دەسەڵاتێکی وا کە نەخشەی بۆ کێشرا بێ و ڕێ و ڕەسمی سەربازی



پشتیوانی لێ بکات و کۆڕەوی ئامێر بیپارێزی، بەقەد ئەوەی دەسەڵاتێکە تانوپۆی لە هزری ئازادی ئەدیب وەردەگرێ و دەوری ڕۆحی دەدات و دەیپارێزێ، لە هەموو خۆبەدەستەوەدانێکی دەسەڵاتێکە لە سەرچاوە لە کوانووی جورئەت و داهێنان و خۆدۆزینەوە و ڕاستبێژی و ڕەتکردنەوەی قووڵ وەردەگرێ، هەستی زەمەنی ڕابردوو و داهاتوو و ئێستای بەیەکەوە گرێ دەدات بۆ ئەوەی لە بەرامبەر هەموو ڕەشەبایەکی ترس و پەشیمانی و دوودڵی بوەستێ، چونکە ڕاستبێژی لە ڕۆژهەڵاتی ئێمەدا تراژیدیای دروست کردووە، بۆیە ئەگەر ئەدەبەدەق دەسەڵاتێکی چنراوی لە ڕاستگۆیی کە داکۆکی لەخۆی بکات، دروست ناکات، ئەوە تووشی ئەو نەهامەتییە دێت، بەم جۆرە دەسەڵاتی ئەدەبی شەرعیەتی خۆی لەقووڵایی مێژوو وەردەگرێ و سەربڵندانە بوونی خۆی لەنێو ئەو مێژووە دەسەلمێنێ، دەسەڵاتی دەق کەمپوتێک نییە لە بازاڕی بزاڤی فیکریدا بەئامادەکراوی دەست بکەوێت، بەڵکو شەونخوونی و خەباتی ئینسانە لەنێو جوگرافیایی هەزارەها سرووت، بۆ ئەدیب ئەو گەنجینەیە داوای دەیان جار کەوتن لەپێناوی بە پێوە مانەوە دێتەکایەوە، تێگەیشتنە لە مێژوو، دەستنیشانکردنی فاکتەرەکانی سەرهەڵدانیەتی بۆ دۆزینەوەی وەعی بەم مێژووە فرێدانی دەقی پڕ لە داهێنان، دەسەڵاتی دەق هەر لەوەوە سەر هەڵنادا کە لەناو خانەیەکی ئەدەبی دیاریکراودا جووڵە بکەین، بەڵکو کردارێکی ـ پرۆسەیەکی گشتییە لە گوتاری ئەبستمۆلۆژیادا ئەقڵانییەتێکە ئەزموونی عومر دروستی دەکات، هەر کات چەمکی ئەوانەمان بۆ وەدەرکەوت ئەوا دەسەڵاتی دەق سەر هەڵدەدات و هێز و بڕست دەنوێنێ، هەڵبەت پەیوەندییەکی هێجگار قووڵ و بەتین هەیە لەنێوان چۆنیەتی دروستبوونی دەسەڵاتی دەق و خوێندنەوە، مادامەکی دەق نوێنەرایەتی جیهانبینی نووسەرەکەی دەکات، ئەوا خوێندنەوە و گوتاری خوێندنەوە هۆیەکە بۆ دروستکردنی ئەو جیهانبینییەی نووسەر.

جگە لەم دەسەڵاتە دەسەڵاتێکی دیکە هەیە کە ئاوەژووی ئەم چەمکە پیرۆزە دەکات ئەویش بوونی ئەدەبی دەسەڵاتدارە کە دوو وشەی بەئەستەم بەیەکەوە لکێنراون و هەرگیز بەیەکەوە هەڵناکەن، چونکە کە دەسەڵاتی دەق سەری هەڵدا دژ بەموڵکداریەتی دەسەڵات دەوەستێ، هەموو خەباتی ڕۆشنبیری بریتییە لە

بەربەرەکانێی دەسەڵاتدارێتی. خوڵقاندنی دەقێکی ئەدەبی لە دروستکردن دەچێ، لە ئەفراندن دەچێ، بۆیەش کاری داهێنەرانە بەکارێکی ئیزەدی دەچێ لە ئەفراندن.... هەربۆیەش دەبێ سەخت و دژوار بێ، کارێک بێ لە دەسەڵاتی هەموو کەسدا نەبێ تەنیا ئەوانە نەبن کە خودانی دیدگایەکی بەهێزن، لەوانە نییە، هەموو کەسێک تا لەوانەش خەریکی کاری داهێنانن بتوانن، ڕۆمانێکی وەک (براکانی کارامازۆف)ی دیستۆفیسکی و دروستکردنی دەیان کەسێتی وەک ڕاسکۆلینکۆف و زرسیما و سمردیاکۆف دروست بکەن، یاخود بتوانن (هاملێت) لە کۆماری خۆیان دروست بکەن و بیگوازنەوە هەموو دنیا، ئەمە پەیوەستە بە کاری خوڵقاندن ئەگەر ئەم خوڵقاندنە بۆ هەموو کەس بلوابایە.... کارێکی ئەستەم و دژوار نەدەبوو، هیچ دووبارە خوڵقاندنێک لەئارادا نییە خوڵقاندن تەنیا بۆ یەکەم جارە ئەمە تەنیا لە بواری دووبارە داڕشتن و خوڵقاندنەوەی ئەفسانە دەبێ، ئەگینا خوڵقاندنی دەقێکی داهێنەرانە تا ئەگەر بەر لەو دەقەش نموونەی هەبووبێ، ئەوا هەر خوڵقانە بۆ یەکەم جار، بۆ نموونە ئەگەر بمەوێ ـ شالیر- ی شەکسپیر بنووسمەوە ئەوە ئەگەر وەک داهێنەرێک شتێکی تازەی لەسەر بونیات نەنێمەوە پێی ناگوترێ خوڵقاندنەوە، بەڵکو پێی دەگوترێ لاساییکردنەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو بەدیدگایەکی تازەوە (شالیر)م دروست کرد، ئەوە عەینی خوڵقانە بۆ یەکەم جار.



# سیمیۆلۆژیا و ئێستەتیکا

وەک زانستێک تا ئێستا لە پانتایی ئەدەبی کوردیدا پراکتیزە نەکراوە، ئەوەش کە کراوە تاک و تەرا بووەو نەیتوانیوە بەتەواوی دەقەکان بەرەو ئاقاری ئەم لێکدانەوەیە ببات... زێتر تەوژمێکی فەرەنسییە زمانی ئێمە پێویستی بە خزمەتکردن هەیە، زۆر لایەنی ئەم زمانە هێشتا لای لێ نەکراوەتەوە. تا ئێستا ئێمە باسی پڕۆسەی دروستبوونی واتای موفرەداتمان نییە، لە زمانی کوردی و هیچ شتێکی لەسەر نەنووسراوە، تا ئێستا هیچمان لەبارەی زانستی زمانی کوردی نەخوێندۆتەوە، هەندێ کەس کاریان لەناو زماندا کردووەو کارەکانیان جێگەی شانازین، بەڵام تەنیا بووینە لەم بوارەدا... سیمیۆلۆژیاش کارێکە لەو کارکردنانە، بەڵێ دەتوانێ خزمەتی ئەم زمانەی ئێمە بکات، بە تایبەت کە زمانی کوردی زمانێکە خاڵی نییە لە ئاماژە، بۆ نموونە ئاماژە کلاسیکییەکانی زمانی کوردی لەناو سەرجەم بەرهەمی کلاسیکیمان هێجگار زۆرە، بەڵام تا ئێستا کەم کاریان تیا کراوە، لە شیعری نالی و مەم و زینی خانی و ئاماژە سۆفیزمییەکانی مەحوی و جەزیری... زۆر وردەکارییان تیایە هەقە ڕەخنەی ئەدەبی کوردی پێیاندا بچێتەوە. هەڵبەت هەموو هەوڵە بەراییەکانی مرۆڤ پڕۆژەیەکی بەنرخ بووبنە بۆ دامەزراندنی بونیاتی شارستانی... بەبێ بوونی ئەو پڕۆژە بەراییانە کەلتووری مرۆڤایەتی نەیدەتوانی بەرەو داهێنانی شتی تازە بچێت بۆ نموونە دۆزینەوەی خەتی هیرۆگلیفی لەلایەن قیبتییەکان بەهەدەر نەچوو... بەڵکو بووە هۆیەک بۆ دۆزینەوەی شفرە و دالی گەلێ جۆری نووسینی دیکە... ڕەنگە ئەوانیش وەک کەلتوور سوودێکی زۆریان لە فەراعینەکانی میسر وەرگرتبێ و هاتنەکایەی ئەم هەموو داهێنانەی ئەهرامەکان بێ ئەسەر نەبووە بەسەر سەرجەم کارەکانی دوای خۆیان... هەروەها خەتی بزماری سۆمەرییەکان و زمانی سانسکرێتی گەلانی هیندو ئەوروپی و نووسینی فەلسەفە ئامێزی تاویەت لە چین تا دەگاتە ئێستاکەی ئێمە، هەر هەموویان چەند ئەڵقەیەکی لەیەک دانەپچڕاوی و

دامەزراندنی شارستانیەت بووینە و پەیوەندییەکی قووڵیان بەیەکەوە هەبوو. کە لە بنەڕەتدا گەڕان بووە بەدوای بونیاتێک کە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری پێ بەڕێوە ببەن، بونیادیش لە بنەڕەتدا چەمکێکی ئەنترۆپۆلۆژی بووە بۆ لێکدانەوەی ئەرکەکانی بەشە پێکهاتووەکانی جەستەی مرۆڤ.... بۆیە دەکرێ بڵێم مادامەکی هەوڵە بەراییەکان لە پێناوی دروستکردنی بونیات بووینە دەکرێ بونیاتگەراییش سوودێکی زۆری لەم بوارانە وەرگرتبێ و بۆ داڕشتنی تیۆری خۆی کە لە ئەساسدا ڕێبازێکی دێرینی شیکردنەوەی شارستانیەتە کۆنەکان بووە، بەتایبەت لەلای لیڤی شتراوس... کە لە دواییدا پراکتیزەی سەر ئەدەب و دەقی ئەدەبی کرا. بەر لە نۆ ساڵ بۆ ئەدەبی کوردی هەندێ بابەتی تازەباو کارێکی هێجگار پێویست بوو وەک پیشاندان، چونکە لە ئەدەبی دەوروبەردا زۆر باس لە بونیاتگەری دەکرا دەبوایە ئەدەبی کوردیش و گەنجەکانیش حاڵی بن لەو شتە تازە باوانە، بۆیە بە پێویستم زانی کە وەک مەعلومەیەکی سەرەتایی و پێناسەیەک شتێ لەم بارەیەوە بنووسم کە بە حەقیقەت شتێکی هێندە هەمەلایەن نەبووە، بەڵکو چۆنیەتی سەرهەڵدان و ماناکەی بوو کە لە دوای منیشەوە جەمال غەمبار کارێکی پوختتری لەم بارەوە ئامادەکرد، ئیدی وردە وردە دەرگا کرایەوە.

بونیاتگەری لایەنی زۆری هەیە و کورت مەودا نییە... ئەوانەش کە پێیەوە خەریک دەبن دەبێ ڕوئیای جەمالی خۆیان بگۆڕن، چونکە بابەتێکی هێجگار وشکی لێکدانەوەی دەقە ئەدەبییەکانە، بەڵام ناکرێ ببێتە پێوەرێکی سەرتاسەری ئیدی هەموو دەقێک بەم پێوەرە بنرخێنرێ، ئێستاکە بە ڕاستی جۆرێک لە پاشاگەردانی هەیە لەم ڕووەوە. بەتایبەت لە گواستنەوە و پیادەکردن بەسەر دەقەکانەوە کتومت شتەکانی پێشانی ئەوان دەڵێنەوە هیچ ئیزافەیەکمان بۆ ئەم ڕێبازە نییە، لە شیکردنەوەی بونیاتی دەقی کوردیدا، چونکە تێگەیشتن لە بونیاتگەری دەبێ تێگەیشتن بێ لە زۆر بواری زانستی دیکە، ئەنترۆپۆلۆژیا بەتایبەتی، سیمیۆلۆژیا، بەلاغە ئاماژە، فینۆمینۆلۆژیا، ڕێزمانی زمان بە گشتی و زانستی زمان بەتایبەتی، ئەمەش کارێکی قورسە و هەموو کەسێ ناتوانێ شانی بداتە بەر.

هەر لە دوای ساڵەکانی هەفتادا بەوەی کە تەوژمی شۆڕشگێڕانەی بزاڤی



ڕزگاریخوازی گەلی کورد لەوپەڕی مەددی خۆی دابوو، پرۆژەی دروستکردنی ڕەخنەی تیۆری و پراکتیکی لە بوارەکانی ئەدەبدا هەوڵی بۆ درا، بەتایبەت بە پێوەرێکی نوێخوازی و گەلێ مشتومڕی ڕەخنەیی پیشاندرا، بەتایبەت لە سەردەمی ڕوانگەدا کە هەوڵی تیۆریزەکردنیان بۆ داکۆکیکردن لە خۆ، بەڵام دیسان ئەم ڕەخنە تیۆرییە لەلای ئێمە دروست نەبوو، ئێمە تا ئێستا جورئەتی ئەوەمان نەکردووە پێوەرێک هەڵبژێرین و بە دەوری ئەو پێوەرە پرۆژەیەکی ڕەخنەیی بهێنینە کایەوەو لە سێبەریا ڕەخنەکانمان داڕێژین. بەڵام لەم دوایەدا بەتایبەت لە دەرەوەی وڵات جۆرێک لەم ڕەخنەیە بنەمای بۆ داڕێژراوە کە دەکرێ ببێتە بنەمایەکی چاک بۆ ئەم تیۆرە بە تایبەت لە نووسینی گەنجەکانی ئەورووپا وەک بەختیار عەلی و مەریوان برهان قانع و هاشم کۆچانی و ڕێبورا سیوەیلی و ڕەفیق سابیرو هەروا ڕێبین هەردی و عەتا قەرەداغی کە جێگەی بایەخ و پێزانینە، هەروەها بوونی گۆڤاری ڕەهەند و چەند گۆڤارێکی دیکە ڕۆڵی باش دەگێڕن لە تاوتۆکردن بۆ ئەم بابەتە زیندووە. ئێستەتیکا مولْکی هەموو ئەدەبێکە کە دەکرێ وەک پێوەرێک دنیایەکی ڕەخنەی لەسەر دابمەزرێنین، چونکە ئەستەتیک لە سیما و خەسڵەتی ناوەرۆک و فۆرمی دەق دەکۆڵێتەوە و ڕوخسارە درەوشاوەکانی دەق دەسنیشان دەکا.... باشلار تەنیا بە جوانییەکانی شوێن جوانترین تیۆری ڕەخنەیی بونیات ناوە، لە ئەدەبی کوردی دێرین و ئەمڕۆشدا ئەم بوارە دەکرێ بەلایەکدا بچین و تەوژمێک لە ڕەخنەی بەدوادا بهێنین، بۆ نموونە دەکرێ باس لە جوانییەکانی ڕووداو و جوانییەکانی شوێن، جوانییەکانی ڕوو بەڕووبوونەوە، جوانییەکانی ئامۆژگاری جوانییەکانی حیکمەت لە (مەم و زین) باشترین پرۆژە دابمەزرێ لە مەودای ڕەخنەدا، هەروەها لە شیعر و چیرۆکی تازەی کوردیدا.

ئەفراندن لە وڵاتێکی ژێر دەستە و چەند ساڵە یەخسیری دەستی داگیرکەران کارێکە سەبارەت بە داهێنەرانی کورد هێجگار قورس و دژوارە، چونکە ئەگەر کارێکی ئورکسترا پێویستی بە هێمنی و جوانی شوێن و دابەشکردنی بالانسەیی بێ کە هێجگار توانا و بڕستی دەوێ دەبێ حاڵی چلۆن بێ لە نیشتمانێک تاکە زەڕڕەیەکی هێمنی بەخۆوە نەدیبێ، هەرواش سەبارەت بەتەواوی داهێنانەکانی دیکە،

بۆیە ئێمەی نووسەرانی کورد دەبێ زۆرتر لە خەڵکی وڵاتانی دیکە وردتر بین، بەسەلیقە بین، تێڕامانێکی ورد و پڕ حیکمەتمان هەبێ بۆ خوێندنەوەی ڕابردوو خوێندنەوەیەک داهێنانی تازەو گەورەی بەدواوە بێ، خوێندنەوەمان هەبێ بۆ ئێستا بەڕ ەوتێک کە ڕابردووی لەگەڵدا بەشێوەیەک موتربە بکەین عیشقی داهێنانی لەدواوە بڕسکێ، هەرواش خوێندنەوەمان هەبێ بۆ داهاتوو، بەئادگارێک کە هەم ڕابردوو هەم ئێستاشی تیا ساو بدەین بۆ ئەوەی بگەینە ڕەوتی شارستانەتێکی بەردەوام، ئێمە دەبێ گلەیی زۆر لە خۆمان بکەین، چونکە هیچ کارێکی وا ئەنجام نەدراوە گەنجانی وا لێ کردبێ کە ڕابردوو بە شت بزانێ، نەوەی ئێستا نەوەیەکی بێ خوێندنەوەی ڕابردووە، لەملا و لەولا سەرچیغیان بردووە، بۆیە چاو بەستە و بەستەدڵ و زمانن. (مارسێل برۆست) مرۆڤی فێری بڕست و خۆڕاگری کرد لەنێو گۆشەگیرییەکی پڕتام و لەزەت و کۆتایی هاتوو بە داهێنان، ئەو فێری مرۆڤی کرد کە لەناو دژواری زەمەندا شوێنێ هەیە لە هزر کە داهێنانت پێ دەبەخشێ و بە ڕۆمانی (گەڕان بەدووی زەمەنی ون بوودا) تەواوی چەمکەکانی کۆمەڵایەتی بوونی ئەدەبی ئاوەژوو کردەوە، هەرواش جۆیس وخاچادۆریان و سێوە و شێخ ڕەزا و جلال الدین ڕۆمی و یۆنگ. بۆیە چێژ وەرگرتن لە بەرهەمی ئەوانە هەمووی ڕەوایە مرۆڤ ناتوانێ بێ چێژ وەرگرتن بەسەریاندا ڕاببوورێ. من بۆ خۆم لەبەردەم مۆسیقاڕی گەورەی جیهانی (خاچادۆریان) سەرسام دەبم و (سێوە) دێتە هانام، لەبەرابەر غوربەت وعیشقی (رۆمی) دا دەوەستم و (مەحوی) دێتەوە دەستم دەگرێ، خۆ ئۆلیسی (جیمس جۆیس) هەر هیچ نەبێ فێری بە مەوسوعە بوونی نووسەرانمان دەکات، ئەوە جگە لەوەی کە (شێخ ڕەزا) بە بەلاغەتی پڕ لە هەجووی خۆی دنیایەکی دیکەمان پێ دەبەخشێ. داهێنەران بەگشتی لوولەی چێژ بەخشین و کرێشمەو تێڕامانن، لێتان ناشارمەوە زۆر لەبەردەم شاعیری گەورەی عەرەب (ئەدۆنیس) دەوەستم و هەمیشە پرسیار دەورووژێنێ، چونکە داهێنەرێکی گەورە و بەسەلیقەی عەرەبە هەرواش سەبارەت بە ( ئەنجیلۆ) کە گەیشتە مەتافی کۆتایی گوتی (کەواتە قسە بکە).

کوردەواریش ئەگەر بەدبەختی و چارەڕەشی و ناهەمواری باری سیاسی ئاوا بە پەند وعیبرەتی نەبردبایە، ئەگەر ڕۆڵەکانی خۆی بۆی سووتابان و هێندەیان سەر لێ



نەشێواندبا لە زۆر میللەتی دیکەی دنیا زیرەکتر و لەبارتر و داهێنەرترن، بۆیە نەک هەر شایانی ئەوەیە ئەدەبی مەزنی هەبێ، بەڵکو شایانی ئەوەیە کە ئاشکراسازی گەلێ بەغارەت کراوی کەلتووری خۆی بێ لەناو میللەتانی دراوسێی خۆیدا، ئەوەتا بەر لە چەندین ساڵ خانی فەلسەفەی نووسیوەتەوە و (نالی) لەناو پانتایی سیمیۆلۆژیدا مەلەی کردووە، داهێنەرانی کورد زۆرن، بەڵام داخەکەم ڕێیان لێ گیراوە خزمەت بەمیللەتەکەی خۆیان بکەن.. دەتوانم بڵێم هەر بەداهێنەکانیان چەند میللەتێکی دراوسێی دەوڵەمەند کردووە، نموونەشمان لەم بارەیەوە هێجگار زۆرە لەناو عەرەب و تورک و فارسدا . بەرهەمهێنانی ئەدەبێکی مەزن پەیوەستە بە سێکوچکەی ( سیاسەت و کۆمەڵ وئابووری) جگە لە خەڵقکردنی جیهانبینی لەلایەن خودی داهێنەرانەوە، بۆیە کوردیش دەتوانێ ڕووبەڕووی حاڵەتی ئەوها ببێتەوە.

گۆران شاعیرێکی زۆر وریا و زیرەک بووە، شارەزای ئەدەبی جیهانیش بووە، سوودێکی زۆریشی لێ بینیون، گۆران لە وەسفدا هێندەی دانتی بەهێز بووە، لە وەسفی بۆ تەبەقەکانی ئاسمان، هێندەی (شێللی)یش ورد بووە لە ڕاوکردنی سەرجەم گریانی مرۆڤایەتی. گۆران بەڕاستی نموونەی ئەو شاعیرە مەزنەیە کە بەشیعری خۆی هاواری کردووە، شیعر پەیوەستە بە گریانی ڕۆحی مرۆڤایەتی و هاوکات ئەگەر پەیوەست درا بەکۆمەڵگە و واقیعەت دەبێتە شتێکی لاواز، هەربۆیەش هەندێ شیعری گۆران کە بۆ سیاسەتی ڕووتی گوتووە زۆر لەڕ و لاوازن، هەرگیز بەراورد ناکرێ لەگەڵ شیعرە جوانەکانی دیکە، حاڵی حازر زۆر کەس هەن تا لە شاعیرە تازەکانیش سەر بەڕێچکە و ڕێبازی ڕۆحیەتی گۆرانن نەیانتوانیوە لە قاوغی ئەودا ڕەت بکەن، تەنانەت زۆر کەمیشن ئەوانەی توانیویانە تەجاوزی ڕۆحیەتی گۆران بکەن لە نواندنی وێنەی ئەودا، گۆران عەصەبی مرۆڤایەتی گرتبوو ئەویش ئەوپەڕی ڕۆمانسییەت، کە زۆر پەیوەست بەدیدی مرۆڤەوەیە. کەمبوونی ڕەخنەی پراکتیکی لە ئەدەبی کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە ڕەخنەگرەکانمان شیعر و چیرۆکیان بەباشی نەخوێندۆتەوە، خودی شاعیر و چیرۆکنووسەکان زیرەکترن و جیهانبینییان فراوانترە، تەنانەت ئەو ڕەخنانەی شاعیر و چیرۆکنووسەکان دەیاننووسن زۆر بەهێزترە لە نووسینی خودی ڕەخنەگرەکان، پاشان ئەو کەسەی

مومارەسەی ڕەخنەی پراکتیکی دەکات دەبێ زۆر شارەزایی هەموو ڕەهەندەکانی ڕۆشنبیری کوردی و ڕۆشنبیری دونیا بێت یا هەر نەبێ ئەزموونێکی زۆر خوێندنەوەی هەبێ، تا بتوانێ بنج و بناوانی ئەو دەقە بگات کە شی دەکاتەوە و ڕەخنەی بەسەر پیادە دەکات، چونکە دەقی ئەدەبی و ڕۆشنبیری دەقێکە ڕسکاوی دوای ئەزموونێکی زۆری نووسەرە، هەرواش پێویستی بەپارسەنگێکی تەواوی ڕۆشنبیری ڕەخنەگر هەیە، ئەمڕۆش لەناو پانتایی ئەدەبی کوردی دا کەم کەس هەن هەوڵ بدەن ڕەخنە وەک پرۆفیشناڵ وەربگرێ و پەلوپۆ بۆ شتی دیکە نەبات، بۆیە لە بواری ڕەخنەی پراکتیکدا زۆر بەدواکەوتین، تەنیا چەند هەوڵێک نەبێ ئەوانیش دەروەستی ئەم هەموو بەرهەمە نایەن کە دێنە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

×××



## بەیاننامەی شیعری و سەرەتا

ئەگەر لەپێناوی چەسپاندنی یەک تاکە ڕوئیەی شیعری بێ، ئەوە کارێکی ناتەواوە و ناتوانێ ببێتە هۆیەک بۆ وروژاندنی نێوەندی ئەدەبی و دەروازەیەک بێ بۆ ئەو کەسانەی خەریکی شیعرن، بەڵام ئەگەر هاتوو بەیاننامەیەک گەلاڵە کرا و جۆرێک لە جیهانبینی فراوانی تیا بێت سەبارەت بە سەرجەم بزاوتی داهێنان ئەوە دەکرێ کاریگەر بێ بۆ نێوەندی ئەدەبی و پرسیارێکی زۆر بوورووژێنێ و گفتوگۆیەکی زۆر دروست بکات و لەدوای خۆشیەوە پرۆسەیەکی ڕەخنەیی پڕ بەها دروست بکات، چونکە جاڕدانی دیدگایەک بە بەیانێکی ئەدەبی ناچارم دەکات بچمە ژێر دەسەڵاتی ئەو دیدگایە، بەڵام چونکە جیهانبینی فراوانترە لە دیدگا، بۆیە مشتومڕی زیاتر هەڵدەگرێ کاریگەریش دەبێ سەبارەت بەنێوەندی ئەدەبی، بەتایبەتی باری شلۆقی ئێستای ئەدەبی کوردی دەیسەپێنێ کۆمەڵێ داهێنەر لە هەموو بوارەکانەوە گەلاڵەی بەیاننامەیەکی بەهێزو ورد بکەن کە زۆر شمولی و هەمەلایەنە.

سەرەتای دەست پێکردن لەلای هەموو نووسەرانی دنیا حاڵەتێکی سیحراوی کەف و کوڵ ئامێزە، حاڵەتە عیشقێکی زۆر سەیرە، ئەگەر بێتوو نووسەر بە هەمان ئەو کەف و کوڵ و عیشقەوە تا کۆتایی ژیانی ئەدەبی خۆی خەریکی کاری داهێنان بێ، ئەوە حەتمەن دوای ئەو ئەزموونە دووردرێژەش دەبێتە خودانی داهێنانێکی بێ نەزیر، بۆیە سەرەتا زۆر گرنگە بۆ هەموو ئەدیب و نووسەرێک، من لە سەرەتادا لەبەر ئەوەی لە بنەماڵەیەکی ئاینی چاوم بەدنیا هەڵێناوە، بەتایبەت کە باوکم شاعیرێکی کلاسیکی بووە، بۆیە کتێب نزیکترین هاوەڵم بووە.. باوکم مرۆڤێکی هێجگار بە سەلیقە بووە، زۆربەی هەموو کاتەکانی خۆی بەخوێندنەوەی سەرچاوە ئاینییەکانەوە بەسەر بردووە... تەنانەت ڕۆژنامەکانی سەردەمی خۆشی موتابەعە دەکردن لە زانستی فەلەک و فەلەکیات لە زانستی بەلاغەت، دیدگایەکی کراوە و زیرەکانەی هەبووە... هەڵبەت ئەمە بۆ نەوەکانی کاریگەریتی زۆری بووە... لانی کەم ئەو

عیشقەی لەلا دروست کردوون کە کتێبیان خۆش بووێ. منیش هەر بەو حاڵەتەوە زۆرشتم لەم ڕووەوە بەمیرات بۆ ماوەتەوە... هەر بۆیەش سەرەتای دەست پێکردنم تەنیا کتێب بووە، تەنیا خوێندنەوە بووە بەبێ ئەوەی حەرفێک بنووسم، من بناغەی نووسینم لەسەر زەخیرەیەکی زەینی و هزری دارِشتووە، بۆیە قەت بەسەرچیغی نەچوومەتە ناو پرۆسەی نووسینەوە... بەڕاستی هەر لە سەرەتاوە من بەئادگاری شیعرەکانم جیابوویمە لە شاعیرانی دیکە. بۆ دیدگای قووڵ کارم کردووە، بۆ تاوتوکردنی جیهانبینییەکی داهێنان هەوڵم داوە و تاوەکو ئێستاش هەر بەدوایدا عەوداڵم لەو سەردەمەی کە سەرەتای من بوو شیعری کوردی تازە دەرگەی مەسەلەی شتی تازە و نوێ و ڕۆژنامە و گۆڤاری لێ بووەوە، شاعیر کەم بوون لە هەولێر، من بۆخۆم زێتر دیوانە شیعرییە کلاسیکییەکانم دەخوێندەوە، زۆرم لەزەت لێ وەردەگرتن هەر لە پۆلی شەشەوە هاتوچۆی کتێبخانەی گشتی هەولێرم کردووە. زۆر شاییم بە کتێبەکانی کتێبخانە دەهات... ئێستاکەش کە دەچم بۆ کتێبخانەی گشتی بۆنی کتێبی ئەوان سەردەمان برینەکانم دەکولێننەوە و یادگارییەکانم دەورووژێنن، لە شاعیرە ناودارەکانی ئەو سەردەمە... مەدحەت بێخەو و کەریم شارەزا و کاکەی فەلاح و هەردی و حەبیب عەلی مەنمی میرانی و بورهان جاهید و ئەوانە هەبوون دیار بوون. دەکرێ ناو لەوانە بنێین ڕەعیلی یەکەمی شیعری تازەی دوای گۆران، پاشان کەوتینە سەر خوێندنەوەی شیعری ڕەعیلی دووەمی دوای ئەوانە کە بریتی بوون لە شێرکۆ بێکەس و عەبدوڵڵا پەشێو وسەعدوڵڵا پەرۆش و ئەوانی تر، هەر لە بواری خوێندنەوەی سەرەتاییمان زۆربەی هەرە زۆری نووسینەکانی مەحموود زامدارمان دەخوێندەوە...ئا بەم جۆرە قەتاری سەرەتا سکەی خۆی گرت و تا وەک ئێستاش هەر بەرەو ئایندە هەڵدەکشێ. دەبێ ئەوە بڵێم ئەگەر دابڕان بەو مەبەستەوە بێت کە تەواو لەو بناغەی بەراییدا بترازێی و ئیدی ببڕای ببڕ ئاوڕی لێ نەدەینەوە، ئەوە هیچ دەقێک هیچ بیرکردنەوەیەک، هیچ زەینێک، ناچێتە ناو قاوغی داهێنانەوە... بۆیە دەکرێ وشەی (دابڕان ) هەر لەمەودا زانستییەکە بەکاربهێنین وەک دابڕانی کارەبا لە فانۆس و مارکس لە هیگل، بەڵام بۆ مەودای ئەدەب بەردەوامبوون هەڵبژێرین کە دوو چەمکی گرینگ لە خۆیدا بەخێو دەکات یەکەم:



چەمکی وەرگرتنی ڕابردوو بەهەموو خورافات و فەلسەفە و دۆگماو داهێنانەوە، دووەمیش چەمکی مانەوە بەرامبەر هەموو ئەو دەستەواژە و بنەمایانە.

تا ئێستا چامەیەک هەبێ کە هەردوو ئەم چەمکەی تێدا حەشار درابێ کەمە لە ئەدەبی کوردیدا، کە دەڵێم کەم واتە چەند چامەیەک هەیە کە بە نوێ و ڕەسەن بژمێردرێن، ئەدۆنیس تا ئێستاشی لەگەڵدابێ گەوهەرەکانی ڕەحمی ڕابردوو دەدرەوشێنێتەوە، کەچی مودێرنیزمترین شاعیری سەردەمی عەرەبە، چامەی (کۆچ)ی شێرکۆ بێکەس و چامەی (شەوانی دیکتاتۆر)ی جەمال غەمبار و چامەی (هەولێرە ماست)ی کەژاڵ ئەحمەد و چامەی ( گۆڕستانی ئەپیکوروس)ی هاشم سەراج و چامەی (دەرگاکان)ی بەختیار عەلی. هەروەها چامەیەکی (مەهدی ساڵح مەجید) کە شاعیرێکی گەنجە بەناونیشانی ( هەڵوێستی ئاو)ە، زێتر لە پەیکەری باوک دەدات، جگە لە چامەی (کۆڵانەکانی ئاو) ی سەباح ڕەنجدەر و( ئۆپێرای گا)ی ئەنوەر مەسیفی و(فرەنۆمی لاستیکی)ی عەباس عەبدوڵڵا یوسف. هەروەها چامەیەکی سەعدوڵڵا پەرۆش کە باس لە پایز و بەفر و فەلسەفەی بوون دەکات هەرواش چامەیەکی نەوزاد ڕەفعەت کە بەناوی (دەربازبوون) بوو، باس لە وێرانی ڕۆحی مرۆڤ دەکات. دەکرێ ببن بە نموونەی باسەکەمان، بەڵام دیارە هەندێکی تریش ماون بەڵام ناکرێ ڕیزیان بکەم. ئەگەر بەوردی سەیری ڕەوتی بەروە پێشوەچوونی دانشگاکانی وڵاتانی دراوسێ بکەین نەک ئەوانەی جیهانی، بەوردی وەڵامی نەگەتیڤی ئەم پرسیارەمان دێتە خەیاڵ، چونکە دانشگاکە زێتر ڕووی ئەکادیمیا و ئەزموون دەگرێتەوە، گەلێک لەو پسپۆر و زانایانەی تیایە کە دەتوانن بزاڤی ڕۆشنبیری لە گەلێ لایەنەوە بەهێز و برِستەوە بکەن بەوەی کە دەورێکی باڵا ببینین لە نوێبوونەوە و نوێکردنەوەی دامودەزگاکانی ڕۆشنبیری بە ڕۆحێکی ڕۆشنبیری و ئەکادیمی و لێتۆژینەوە لە ئەنجام و هۆکارەکانی، دانشگا گەورەترین دامەزراوی مەعریفەیە لە وڵاتدا، هەر لە ڕێگەی خوێندنەوە بیستوومانە و خوێندوومانەتەوە کە دانشگاکان دەورێکی فرە بەهێزیان گێڕاوە لە پەرەپێدانی ڕۆحی زانستی و بەدەیان هەزار ئیبتکارات وداهێنراویان خستۆتە ئاراوە، لە هەموو ڕووێکەوە، ئەمڕۆ لە دانشگاکانی کوردستان جۆرێک لە کپی و بەشدارینەکردن هەیە

لەم ڕووەوە، ئەمڕۆی کۆمەڵگەی کوردستان پێویستی زۆری بە هەوڵ و تەقەللای زاناکانی دانشگا هەیە کە ڕۆحی زانست و ڕۆشنبیری لەناو خەڵکدا قووڵ بکەینەوە، زۆربەی ئەو بەرهەمانەی کە لەلایەن ئەکادیمی و خودانی شەهادە بەرزەکان دێنە ئاراوە هەر بەتەنیا بەرهەمی ئەدەبین، کە ئەمەش لایەنێکی زۆر کەمە لە ڕیزی بزاوتی ڕۆشنبیری و هەندێ لەوانە تەنیا شەهادەکانیان وەرگرتووە و ئیدی خەریکی ناو ئەرویقەی دانشگان و کاریان بەهیچەوە نەماوە، جگە لە دەرس گوتنەوە نەیانتوانیوە ئەزموونی خۆیان لە فرێدانی بەرهەمی بایۆلۆژی و سیمیۆلۆژی و ئەنترۆپۆلۆژی... تاد بخەنە ڕوو.... کارێ بکەن کە پەرە بە ڕۆحی ئەو زانستە بدەن و بۆ ناو خەڵکی بگوازنەوە. بەڵام ئێمە هیچ بەراییەکی ڕەخنەییمان نەبووە، چونکە ڕەخنە لەسەر ئەزموونی بەرایی قۆناغەکانی ئەدەبی دروست دەبێ، ئێمەش لەسەرتاسەری قۆناغەکانی بەراییدا کەمتر نووسەرێکمان هەبووە باسیان لە ئەزموونی خۆیان کردبێ کە ئەمە کارێکی گرینگە بۆ ئەوەی ڕەخنەگرەکان لانی کەم ڕەوتی چۆنیەتی نووسینیان بۆ ئاشکرا ببێ.

بەدرێژایی هەردوو هێڵی ئەدەبی و سیاسی ئەم دوو چەمکە لەیەکتر جیابوونەتەوە وەک فۆرم و ناوەرۆک.... بەڵام هەر بەدرێژایی ئەم دوو هێڵە دوو ئەقنومی پەیوەست بەیەکتر بووینە، دابڕینی چەمکی ئەدەبی لە حاڵەتە سیاسییەکان کارێکی ئەستەمە.... چونکە سیاسەت هەر بە تەنیا کاری بەڕێوەبردنی دەوڵەت یا حیزب یا چین و توێژێک نییە بەڵکو سیاسەت بریتییە لە کۆمەڵ، ئابووری پێوەندی مرۆڤایەتی وگەلێ شتی دیکە.... بەڵام بۆ مەسەلەی خۆگرێدانی ئەدەب و ئەدیب بەسیاسەتەوە و ئەم خۆگرێدانە ببێتە هۆی ئەوەی کە لەناو کرۆکی ئەدەبەکەدا یاخود تەعبیر لەو سیاسەتە بکات ئەمە لە بەهای داهێنانی گەورە کەم دەکاتەوە.



## گۆڵدمان حەللاج

بەرهەمەم و نووسینەکانی هەموو بەسەر بونیاتەوە بوو، هەوڵی داوە لە ئاستی ئەدەب و دەقی ئەدەبیدا پەرە بە لێتۆژینەوەی سۆسیۆلۆژی بدات... هەموو نووسینەکانی سەبارەت بەبونیانەوە کارتێکەری (ژانپیاژێ) ی پێوە دیار بووە، بەڵام (گۆڵدمان) چەمکی بونیاتی پێکهاتەیی هێنایە ئاراوە کە پەیوەستە بەکاربڕی هاوسەنگ بوون لەنێوان ویژدانی باڵا و خودی مرۆڤ و ئەو پێی وایە کە ئەم هاوسەنگ و بالانسە لە ڕێگەی کار پەردازی لێکترازان و هەڵوەشانەوەی بونیادەوە سەر هەڵدەگرێ و دروست دەبێ و دادەمەزرێتەوە، لە سەرەتادا ئەو تێرمی بونیاتی ڕەت کردەوە بەوەی کە هیچ حاڵەتێکی ستاتیکی تێدا نییە و ناکرێ دابڕی بکەین لە شوێنکات ( شوێن و کات) ئیدی بەم جۆرە بونیاتی پێکهاتەی وردە وردە لەسەر دەستی لۆکاش مارکسیزم و گۆڵدمان پێکهات و بڵاو بووەوە، لەسەر ئاستی سۆسیۆلۆژیای ئەدەبی پیادە کرا، لای لۆکاش پەیوەست بوو بە ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی دەقە ئەدەبییەکان و لای گۆڵدمان تەنیا ئەوە نەبوو بەتەنیا سەیری کەسێتیی بکرێت، بەڵکو بریتی بوو لە کۆهۆش و کۆورییایی، بۆ ئەوەی کوردی خۆمان، پێم وایە دەکرێ سوود لە هەردوو ئەو بەرایی و بۆچوونانە وەربگرێت و پیادە بکرێت لە نێو پانتایی ئەدەبی کوردیدا.. چونکە بونیاتگەری پێکهاتەی خوێندنەوەیە بۆ دەقی داهێنەرانە. بۆ ئەم مەبەستە دەبێ ئێمە مەسەلەی بونیاتگەری پێکهاتەیی بەسەر سێ لایەن و قۆناغی گرینگەوە پیادە بکەین.

یەکەم: قۆناغی کلاسیک کە دەکرێ هەم ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی و هەم ئاگاهی کۆمەڵایەتی و هەم کەسێتی تێدا ڕەچاو بکرێ...

دووەم: قۆناغی دوای کلاسیک کە زێتر پەیوەستە بە ڕەفتاری مرۆیی.

سێیەم : قۆناغی ئێستاکە کە ئێستەتیکا و چەمک ڕۆڵی خۆیان دەگێڕن.... حەللاج نموونەی ئەو مرۆڤانەیە کە پێیان وایە باوەڕەکەیان زۆر گرنگترە لە جەستەیان، فەنابوونی خۆیان تا ئەبەد لە ڕێگەی ئەو ڕۆحەوەی کە شەلاڵی ئەو باوەڕە بەتینە

هەرگیز کۆتایی نایەت، تەنانەت ئەگەر بەئێش و ئازارێکی لەسەر خۆوەش کۆتایی بە جەستەیا بهێنن، ئەو هەمیشە مکوڕتر دەبێ لەسەر باوەڕی خۆی، ئەو کاتەش کە لەسەر ئەپەرتمانە بەرزەکانی سەردەمی سوڵتانەکان یەکە یەکە دەست و قاچیان هەڵدەپاچی، ئەو هێشتاش هەر لەسەر بیروباوەڕی (انا الحق)ی خۆی نەهاتبووە خوارەوە، هەر بۆیەش کاربەدەستانی ئەو سەردەم لەیەکە یەکە جەستەی ئەو مرۆڤەی دەترسان نەوەکا زیندوو ببنەوە تا دوایی بەدەم سووتاندنیەوە خۆڵەمێشەکەیان فڕێ دەدا دەریاوە، ئێش و ئازاری حەللاج، ئێش و ئازارێکی سادە نەبوو، ئێش و ئازاری ئەو ڕۆحە بوو کە لەناو گەڕانێکی هێندە تووش و پڕ نەهامەت بووە کە پێیان وابووە نەبوونی بیروباوەڕێکی جیا لەخۆیان دەبێتە هۆی وردوخاشبوونیان، ئەوەبوو حەللاج لە سەردەمی خۆیدا بەم دەردە چوو، یەکێ لەو دیاردە گرینگانەی لە سەردەمی جەزرەبەدانی حەللاجدا ڕووی دا ئەوە بوو کاتێک خوێن لە هەموو گیانی بازرقەی دەدا وردە وردە ڕەنگی حەللاج زەرد هەڵدەگەڕا، حەللاج بۆ ئەوەی ئەو ڕەنگە زەردە بشارێتەوە بەخوێنی خۆی دەم و چاوی خۆی سوور کرد، کە لێیان پرسی ئەم کارەی لەپای چی کردووە، لە وەڵامدا گوتبووی نەوەکا وا هەست بکەن من لە ترسان ڕەنگم زەرد بووە، حەللاج لەروانگەی زۆربەی هەرە زۆری ئەوانەی باسیان کردووە، لەنێو هەموو ئەو فەیلەسووفە سۆفییانەی وەک بوستامی، محێدینی عەرەبی و سەهرەوەردی و زۆرانی دیکە لەهەر هەموویان چاونەترستر بووە، لە گۆشەی (وحدة الوجود)ێکی سەیردا دەژیا، خودانی یۆگای (تەئەممول) و، ڕیازەی ڕۆحی گەورە بوو، کە ئەمانە هەمووی وای کردووە، بۆ تا هەتا حەللاج زیندوو بێت، جگە لەمە هەر لە ڕوانگەی سۆفیگەرانەوە کە باوەڕیان بە(مراتب) نەبووە بۆ گەیشتن بەئایدیای ئەو ڕۆحەی کە ئەوان دەیانویست لەگەڵیدا تێکەڵ ببن، حەللاجیش لە چەندین دەقی خۆیدا ئەو حەقیقەتەی پیشان داوە.

زۆرن ئەو شاعیر و ناودارانەی کە بەدرێژایی زیندەگی خۆیان هەمیشە پێیان وابوو کە ئەم زەمەنە پووچە شایەنی ئەوە نییە مرۆڤ بەئاگاهییەوە ژیانی خۆی تێدا بەسەر بەرێ، ئەم بەهەند هەڵنەگرتنە پێ بزانین یا نەزانین جۆرێک لە میتۆدی پووچ گەرایی دەبەخشێ بەفەلسەفەی ژیان، کەوا لە مرۆڤ دەکا بیربکاتەوە کە ئاخۆ ئێمە بۆ هەین



؟ ئەم پرسیارە مرۆڤ بەرەو زۆر لا دەبات و وای لێ دەکات هەندێ جار لەناو گێژاوی فەلسەفەی بێهوودەییدا مەلە بکات و هەندێ جاریش لە ناو ئەگزیستانسیالیزم بتاوێتەوە و هەندێ جاریش دەبێتە گەڕۆکێک بەدوای بەدیلێک بۆ ئەم ژیانە کە ناویان ناوە (زەمەنی مەستی)....زۆر لەو شاعیرانەی وەک (حسێن مەردان)ی عەرەب و (بۆدلێر)ی فەرەنگی، (یەسەنین) ی ڕووس وزۆربەی هەرە زۆری شاعیرانی دونیا بەدوای ئەو زەمەنە مەستییە گەڕاون لە پێناوی نەفیکردنی زەمەنی واقیعدا.... تەنانەت شاعیرێکی موتەصەیفی گەورەی وەک عومەری خەیام و زۆربەی شاعیرە سۆفییەکان هەمیشە زەمەنی مەستی مەجازی هۆیەک بووە بۆ لەناوبردنی زەمەنی واقیعی، دیارە ئەوەش ناگاتە ئاستی واقیع، بەڵام بەهەرحاڵ نەفیکردنێکی کاتییە و دەتوانرێ هەمیشەیی پێ ببەخشرێ. پێم وایە لە خانەکانی فیکر و کایەکانی مەعریفەدا، مادامەکێ هەوڵێک بۆ بزاوتی هزر هەیە هیچ جۆرە تۆمەتێکی وەک ڕیڤیژینزم لەئارادا نییە، هەر بۆیەش هەبوونی ڕەخنە لەلایەن کەسێکی مارکسیستەوە بۆ خودی ئایدۆلۆژیای مارکسی کارێکە نابێ تۆمەتی ڕیڤیژنیزمی بدەینە پاڵ، کە جۆرج لۆکاش یەکێکە لەو نموونانەی دەکرێ بخرێتە ژێر قاڵبی ئەم بۆچوونە، خودی جۆرج لۆکاش کە دێتە سەر باسی (رۆمان وەک مەلحەمەیەکی مێژوویی) باس لە واقیعی ڕۆمان دەکا و دەگەڕێتەوە سەر کرۆک بۆ لێکدانەوەی هزری مرۆڤ سەبارەت بەواقیع.. جا هەندێ جار ئەم واقیعە واقیعێکی ڕەجعییانە بووە، بەڵام داهێنانی لەسەر خوڵقاوە، دیارە لۆکاش لەو کەسانە بووە کە باوەڕی بە بوونەوەی هزر و کرانەوەی ئەقڵ بووە لەسەر مەدارێک نەوەستاوە، لەنێو کۆمەڵگایەکی دۆگما و چەقبەستوو بەسەر یەک فیکردا، هەڵبەت ئەم جۆرە تۆمەتانە بۆ کەسانی ئاوا دروست دەبێت، لۆکاش فەیلەسووف و ئەدیبێکی هەنگاری بوو، لە دانشگای بۆدابست مامۆستای هونەر و کەلتوور بوو خودانی کتێبی ( پەرەسەندنی درامای تازە –١٩٠٨) و (رۆح و شەکڵ –١٩١١) هەروەها زۆر لیکۆڵینەوەی دەربارەی بالزاک و ستاندال و ئەمیل زۆلا و ڕۆمانی مێژوویییەوە هەبوو، لەبارەی قەیرانی فەلسەفەی بۆرژوازیدا گوتار و کتێبی نووسیوە، بەریڤیزنیزم لەقەڵەمدانی لە ئەقلانیەتی ئەو کەم نابێتەوە.

## دەق و خوێندنەوە

بەڵێ دەقی سەرکەوتوومان هەیە خوێنەری زیرەک دەتوانێ دەستنیشانی بکا، ڕەنگە هەندێ دەقی واشمان هەبێ تەجاوزی ئەدەب و داهێنانی میللەتانی دراوسێی کردبێ، حەز دەکەم ئەدەبی نووسراوی خۆمان بەکەم لەقەڵەم نەدەین... ئێمە میللەتێکی ژێر دەستە و ڕووت و ڕەجاڵ بووینە، هیچ میللەتێک وەک ئێمەی بەسەر نەهاتووە، ئەگەر سەیری ئەدەبەکەی خۆمان بکەین هەر لە کلاسیکییەوە تا وەک ئێستا بە دەیان و بگرە بە سەدان دەقی باش و سەرکەوتوومان هەیە کە ناکرێ لێرەدا ڕیزیان بکەین. نالی دەقی گەورەی نوسییووە، مەحوی دەقی گەورەی نووسییوە، مەلا حەمدون دەقی گەورەی نووسیوە... هەرواش ئەحمەدی خانی و جزیری کە ئەوانەش پایەی ئەدەبی کلاسیکین دیارە نوێش لەسەر ئەم پایە بەهێزانەوە هاتووە، حەتمەن دەقی تازە و سەرکەوتوویان پێیە... خوێندنەوە پێداویستییەکی حەتمییە بۆ ئەوەی هزر وشک نەکات، وشککردنی هزر بەمانای کۆتایی هاتنی ئینسانە، جا ئەم خوێندنەوە لەپێناوی ئەوە بێ کە ئەقڵ و هزر بەرەو ئاقاری داهێنان بکرێتەوە، یا بۆ ئەوەی کە لە مانا و پشتی مانای شتەکان و مرۆڤ بگەیت، بەتایبەت مرۆڤی هزرڤان و ئەدیب کە یەکێ لە خەسڵەتەکانی بەردەوامبوونی داهێنان تەڕوپڕ کردنیەتی بە خوێنی تازە، بە شارەزایی تازە، مەحاڵە بێ خوێندنەوە بتوانیت هزر لە ئاستی پەرەسەندنی مەدەنیەتدا بی ـ هەردوو خوێندنەوەی ستوونی کە ڕووبەڕووبوونەوەیەکە لەگەڵ ناوەڕۆک بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کە هەموو کەناڵەکانی زەین و هزری لەگەڵدایە، لە هەست و شعوور و تێڕامان و لێکدانەوە و بیرتیژی خوێندنەوەیەکی ماقووڵ و پڕ وەرگرتنی چەشە و چێژە، پێم وایە خوێندنەوەی ئاسۆیی بۆ شتە نا دیارەکان دەکرێ، بۆ ئەو دیدگایانە دەکرێ کە هێشتا توانای وەدەستهێنانیان ئەستەم و دژوارە، خوێندنەوەی ئاسۆیی گەڕانێکە بەنێو بازنەکانی دەرەوەی هزر و فڕین لە کانگای خەیاڵ و فانتازیا زێتر پەیوەستە بەداهێنان، بۆیە



تێکەڵ بە ڕەوت و فۆرمی ئاسۆوە بووە، لە خوێندنەوەی ئاسۆییدا خەیاڵ سەرقافڵەی هەموو کەناڵەکانی زەینە، بەرهەمهێنەری دیمەن و ڕووداو و داڕشتە و فۆرم و ناوەڕۆکە، بەخوێندنەوەی ستوونی و ئاسۆیی داهێنان لەناو پانتایی ئەدەبدا شەوق و ڕەونەقێکی زۆری دەبێ، لێکدانەوەی دیکەش هەن بۆ ئەم دوو جۆرە خوێندنەوەیە. دەسەڵاتی دەق دەستەواژەیەکە لەسەر جەستەی ترس، زێتر پرسیار بەرهەم دێنێ، یاخود پرسیارێکە بۆ ئەفراندنی دەیان پرسیاری دیکە، دەچێتە کایەی لەناو بردنی وەڵامی هەمیشە لەسەر زار و وەڵامە ئامادەکان، ئەو وەڵامانەی کە لەڕاستیدا وەڵام نین بەقەد ئەوەی پەردەکێشانە بەسەر حەقیقەتەکان، هەر کاتێکیش پرسیار وەڵامی ئاوەهای وردوخاش کرد ئەو کاتە سەرەتایی سەرهەڵدانی و داهێنانی ڕاستەقینە دێتەکایەوە، خوڵقاندنی دەقێکی ئەدەبی لە دروستکردن دەچێ، لە ئەفراندن دەچێ، بۆیەش کاری داهێنەرانە بەکارێکی ئیزەدی دەچێ لەئەفراندن.... هەربۆیەش دەبێ سەخت ودژوار بێ، کارێک بێ لە دەسەڵاتی هەموو کەسدا نەبێ تەنیا ئەوانە نەبن کە خودانی دیدگایەکی بەهێزن، لەوانە نییە، هەموو کەسێک تا لەوانەش خەریکی کاری داهێنانن بتوانن، ڕۆمانێکی وەک (براکانی کارامازۆف)ی دیستۆفیسکی و دروستکردنی دەیان کەسێتی وەک ڕاسکۆلینکۆف و زرسیما و سمردیاکۆف دروست بکەن، یاخود بتوانن (هاملێت) لە کۆماری خۆیان دروست بکەن و بیگوازنەوە هەموو دنیا، ئەمە پەیوەستە بەکاری خوڵقاندن ئەگەر ئەم خوڵقاندنە بۆ هەموو کەس بلوابایە.... کارێکی ئەستەم و دژوار نەدەبوو، هیچ دووبارە خوڵقاندنێک لە ئارادا نییە خوڵقاندن تەنیا بۆ یەکەم جارە ئەمە تەنیا لە بواری دووبارە داڕشتن و خوڵقاندنەوەی ئەفسانە دەبێ، ئەگینا خوڵقاندنی دەقێکی داهێنەرانە تا ئەگەر بەر لەو دەقەش نموونەی هەبووبێ، ئەوا هەر خوڵقانە بۆ یەکەم جار، بۆ نموونە ئەگەر بمەوێ ـ شالیر– ی شەکسپیر بنووسمەوە ئەوە ئەگەر وەک داهێنەرێک شتێکی تازەی لەسەر بونییات نەنێمەوە پێی ناگوترێ خوڵقاندنەوە، بەڵکو پێی دەگوترێ لاساییکردنەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو بەدیدگایەکی تازەوە (شالیر)م دروست کرد، ئەوە عەینی خوڵقانە بۆ یەکەم جار. خاسیەتی خۆی هەیە و جیایە لە شیعرێ کە پەیوەست نەبێ بە دراماوە... کە دەڵێم شیعری درامی واتە ئەو شیعرە فیعلی درامی تێدا

بێ.... چەند ئەزموونێک هەن لەناو ئەدەبی کوردی کە شیعری درامی تێدا خولْقاوە.... شیعری درامی پێویستی بە دروستکردنی دەنگی جیا جیا هەیە لەناو یەک ڕووداودا، هەڵبەت شیعری درامی لە ئەدەبی کوردی دەگمەنە، هەندێ شیعر درامای خۆیان هەیە، بەڵام لەپشتی خوێندنەوەدان نەک لەناو خودی شیعرەکە، واتە سرووتی درامیت بۆ دەخوڵقێنێ بێ ئەوەی خاسیەتی درامییان تێدا بێ، شێرکۆ بێکەس شیعری درامی نووسیوە خۆم لە دیوانی وردە گەڵا شیعری درامیم نووسیوە پێویستی بە شارەزایی هەیە لەدروستکردن و بەرەو ترۆپک بردنی ڕووداوەکان و دروستکردنی خەتی تراژیدی و کۆمیدیا و باقی مەسەلەکانی دیکە، (مەحموود زامدار) لە (کۆمیدیای کەرایەتی)دا درامایەکی خەمبار و تراژیدیایەکی خەمباری دروست کردووە، لە (دەردە کورد) توانیویەتی ئەم بیرۆکەیە بەرەو ترۆپک ببات و دراما دروست بکات، دەتوانین باس لە نموونەی درامی بکەین لە قەسیدەکانی (مەحوی)، چونکە چەمکی (وەحدة الوجود) ی بە دەنگی جیا جیا تێدایە. نموونەی تریش هەن.

# پێڕست